دەزگای فام
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

دەزگای فام بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، دامەزراوەیەکە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب، لە 21/8/2019 دامەزراوە، هەوڵ دەدات بە شێوەیەک کتێب چاپ بکات، کە هەم لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، هەم لە ڕووی هونەری و تەکنیکییەوە لە ئاستێکی بەرزدا بێت، هەروەها لە ڕووی نرخەوە، دۆخی خوێنەران لەبەرچاو دەگرێ و هەوڵ دەدات کتێب لە هەموو بوارە جیاجیاکانی ئەدەبی، سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری و منداڵان و.... چاپ و بڵاو بکاتەوە..

فام: ئاوەز، تێگەیشتن [هەنبانە بۆرینە، هەژار: ل516]، [فەرهەنگی کوردستان، گیوی موکریانی: ل 664]. [فەرهەنگی خاڵ، شێخ محەمەدی خاڵ: ل313]

FAMpublication

# ناوەڕۆك

لەسەر زاری باپیرانەوە شاری ((سێکوان)) پێش قەڵە مێژوو بنیات نراوە.

هەر لە ئیجادەوە بە هۆی تێککردنەوەی دوو ڕووباری گەورە و بەخوڕ لە ناوەڕاستیدا بووبووە سێ ((کوان))ی لە یەکتر جوودا.

ئاوی ڕووبارەکان لە گڕی گەرمادا کەمتر و لەدوورەوە شین دەچێتەوە، هەرکە لێی نزیک ببیتەوە ئاوێکی ئاسایی و ساف و بێگەرد. قۆنگرەی لێ بەدی ناکرێت، تەنیا لە هێندە شوێنان گێژەن دەکات.

● نۆبات ماسی لەملا و لەولاوە خۆیان بۆ... بۆشایی حەوا هەڵ دەدەن و شەپە لە ئاوەکە دەهێنن و چەند پڕووشکێک بەرز دەبنەوە و دیمەنێکی دلڕفێن و هەست بزووێنی وا هەر زێنەتە بە دیقەتی سێرەگرتن بە دیارییەوە بوەستیت.

● کەچی لە وەرزی باراندا ئاوەکانیان نۆبات دە هێندەی پێشوو زیاتر دەبن و گێژەنیان کەم و زۆر نامێنێت، شەپۆل لە دوای شەپۆل و قۆنگرەش لە باس نایەت. ئەوسا هەردەم هەڵکشان و داکشانیان لەمبەر و لەوبەر دەبیندرێت و هێمایان بۆ دابندرێت و گریمان ئاوێزانی بوونایە لە زێدەبووندابوون. بەجێیان هێشتبووایە نیشانەی کەمبوونەوە بوو.

- شـــەپۆلیان لە کــاتی باهەڵکردنــدا ســێ چــوارە مەتــر دوورەلێوار شەپە لە زەوی دەهێنێت و تۆز بەرز دەبێتەوە.
- ئاوەکــان بە بەرەوازیــی پێشــوو لــێلە و بە کەڵــک خواردنەوە و ڕیژە و پیژەش نایێن.

***

**کوانی یەکەم:**

باشوور و خۆرئاوای گرتووەتە باوەش و خاک و ئاو و هەوای لەگەڵ هەرچی داری بەبەرە دەگونجێن و بەرهەمی کشتوکاڵ و ولسات ئەوەندە زۆرە لە پێویست بەدەرە و کان و کانزاش هەر لە باس نایەن.

گەر بە دەستێکی ئەمین بسپێردرێن گوزەرانی هەرچی دانیشتووانی هەر سێکوانە بە زێدەوە پێ دەکەن.

بۆیە ساڵ دوازدە مانگ بووەتە قوچەکی چاوتێبڕانی هەر چوار ئا لەوە.

خەڵکەکەشی بە ((باشوا)) ناو دەبرێن.

**کوانی دووەم:**

لە ڕۆژهەڵات دانیشتووانی ((ژلات))یان ناوە.

**کوانی سێیەم:**

باکوور کەوتووە و میللەتەکەشی بە ((بار)) بانگ دەکرێن.

* * *

به هەوڵ و تەقەڵای یەکجـــار زۆری ((داگییەکـــان))ەوە ڕووبارەکان کراونەتە سـنوورێکی دەسـتکردی زەقـی نێـوان کوانەکانەوە.

هێندێک لە خەڵکی هەر سـێکوانان، ناخاسـمە غەوارەکـان هەردەم بە گـوڕ و سـۆزی لێبانلێسـییەوە خۆیـان لە قەرەی سـەرکردەی ((داگییەکـان)) هەڵدەسـوون و خواخوایـانە فەرمانێکیـان لە زار دەربێـت، دەلحـاز بەوپەڕی حەزیـانەوە دەست لەسەر سینگی تەوازووی خۆبزانە بەجێی دەگەیەنن.

بـۆیە هەردەم بە پفێکیـان بە حەوا هەڵـدەچن و بە پفـی دووەم تەرزی ئـاگری ((بـڕە سـۆرە)) بە کونفەیەکونێـک دادەمرکێنەوە.

ڕووگەی هەڵسـوکەوتی خەڵکـی هەر کوانێـک بە هـۆی هەڵوێسـت و تەقەڵا و دەرسـدادانی زەبربەدەسـتانەوە لەگەڵ ئەویتـر ئەوەنـدە لە یەکتـر دوور و نـامۆنەوازەن، دەبردرێـت هەریەکەیـان لە ئیجـادەوە نەتەوەیەکـی سـەربەخۆیە و بە ئەندازەی لەپکەیەک پەیوەندییان لە نێواندا نەڕوواوە.

هەر لایەنێکـیش خـۆی بە حەقپەرسـت و میرپەنجـۆ دەخەملێنێت و ئەوانی دیش پەڕۆپیسی ژێر کەندووان.

***

# گرووپی داگییەکان

## گرووپی داگی یەکەم:

لە کوانی یەکەمدا بە ((داگیرەش)) ناودارن. لەژێر ڕکێبی ((ڕەشزۆ)) دانە.

ڕەشزۆ ناوە وەک خووی بێت بە فاکوفیکی دەغەزەوە بە ڕووی میللەتی ((باشوا)) هەڵدەشاخێت و:

- ئێوە خوای مەزن بۆ ئەوەی دروست کردوونە گەورە و بچووک و نێر و مێتان ساڵ دوازدەی مانگ بەردەوام لە خزمەتی ئێمەی ((داگیرەش))دا بە هیچ شێوەیەک نەسڵەمێنەوە و تەرحی نوێژ و ڕۆژی بە فەرزی بقەبڵێنن.

لە لایەکی دیکەوە هەر ئاوا پێویستی سەر شانتانە لە زمانە چرووک و تڕووهاتەکەی خۆتان نەک هەر دوورکەونەوە، بگرە بە گلاوی بچووێتن و ڕووتان بەوپەڕی کەیف و سۆزەوە بە لای زمانە پیرۆز و ڕەسەنەکەی ئێمە، کە زمانی

دانیشتووانی بەهەشتە، وەرگێڕن. ئەوسا بێگومان یەزدانی مەزن لە دنیا و قیامەتدا سەزفرازتان دەکات و ئێمەش بە پێویستی دەزانین ئێوە هەردەم بە دۆستی خۆمانتان بخەملێنین و هیچ ناکۆکی و جیاوازییەکتان لە کۆڕی ژیاندا لەگەڵ ئێمەی وجاخزادەی دەڤەرەکە نابێت.

ئەگەرنا خوا هاوار و خوا تۆبەتان دەقەبەڵ دەکرێت.

باشواکان حەیر مان و کەم و زۆر نەیاندەزانی مەرام لەو هەرەشەوگورەشە خۆڕاییانەیان چییە و چۆنە؟!. کەچی لە دڵی وردودرشتیان سەقا درابوو: زاڵم و زۆرداری وەک خۆیان لە دەڤەرەکە سەری هەڵنەداوە. لەبەر بێدەسەڵاتییەوە ملی تەوازوویان قڕوقەپانە داهێنا.

***

## گرووپی داگی دووەم:

لە کوانی دووەمدا بە ((داگیزەر)) بانگ دەکرێن.

سەرکردەکەیان ((زەرف)) بوو، ڕووی بافرەداری لە نەوەی ژلات کرد و گوتی:

- ئێمە هەر لە بوونەوە یەک ڕەگەزین و بە موویێک جووداوازیمان نییە. تەنیا ئەوەندە نەبێت، پەروەردگاری مەزن ئێمەی بە براگەورە ئەفراندووە. بۆیە لەسەر گەورە و بچووکی ئێوەی ((ژلات)) هەردەم پێویستە لە هەموو ڕوویێکەوە، بە تەوازووەوە ملکەچی برا گەورەی خۆتان بن و کەم و زۆر نابێ لەژێر داری دادپەروەری ئێمە دەربچن، ئەگەر نا بۆ خواتان پێ دەڵێین، زۆر خراپ بەسەرتاندا دەشکێتەوە. ئەوکات تەنیا هەر خۆشتان بەرپرسیار دەبن.

ژلاتییەکان ناچار، خۆشی و ترشی، سەری بەندایەتییان، بێ کێشمەکێش و متەقەوە دانواند.

***

## گرووپی داگی سێیەم:

لە کوانی سێیەمدا بە ((داگیسوور)) ناو دەبردرێت.

جڵەودارەکەیان ((سورتک))ە و ڕووی بە دڕدۆنگییەوە لە نەتەوەی ((بار)) کرد و گوتی:

- خوای مەزن ئێمەی هەر لە یەکەم وەهلەوە بە سالاری ئێوە خولقاندووە، بۆیە بە گوێرەی دەستووری ئاسمان و زەوی ئێوە دەبێ هەردەم وەک بەندە و خوبزە لە ژێر دەسەڵاتی ئێمەی وجاخزادە و خاوەن زەوی و حەوا، دار لە خۆتان نەدەن. ئەگەرنا لە ئایینی پیرۆزی ئاسمان وەردەگەڕێن و دەکەونە کۆندڕەوی زەندیقایەتییەوە.

لەسەر ئێمەش ئەوسا پێویست دەبێت سەری گەورە و بچووکتان لە گۆڕی ئەژدادتان بنێین.

بار چاکی دەناسین، زگرەشی وەک خۆیان سەری هەڵنەداوە. ناچار لە بێدەسەڵاتی و دووره خوایشتی حەزیانەوە ملی سەلماندنیان لارکەنەوە.

***

سەرکردەی داگییەکان هەرسێکیان دابونەریت و خوویان بوو:

- کارێکی نامۆیان لە ئاست دانیشتووانی هەرسێکواندا بەرەنگار بووایە، دەلحاز کاری رۆژانەیان هەر زوو تـوورِ دەدا و بە گەرموگورِەوە کۆرِیان دەبەستا.

چەنــــد رِۆژ لەســـــەر یەک بە شـــــەوقی حەزیـــــانەوە کۆبووبوونەوە و گفتوگـۆی فـرەزۆری نێوانیـان و پەنـجە هەڵشەقاندنی قار و هەرِەشەی بەردەوامی و:

- ئەوا مــــاوەیەکی زۆرە مـــیللەتە ناکەســــبەچەکانی: ((باشـوا و ژلات و بـار)) لێکـرِا لە جموجـۆڵی دژایەتیـی ئێمەی خاوەن خـاک و ئاسـماندانە و لە پێـوەدانی خۆیـان هیچ کات داناکەسێن و نیازیانە لە ئاستماندا گووخواردن و پێدرێژییە و دەبێژن:

- ئێمە دەمانەوێـت لەژێـر دەسـەڵاتی ئێـوەی داگـی بە یەکجاری رِزگار بین و سەربەخۆ، بنیادەمانە تەرحی ئێـوە بژین.

- گوتنی ناوێت و کەسانی عولعولی و عەقڵ قوندەش پێ حسیاون.

کپییەکـی خەمـاوی بەسـەریاندا زاڵ بـوو و هەر زوو بە هەڵچوونەوە:

- پێویستە هەر سێ لامان هێزمان بلەز یەک بخەیـن و لە هەر لاوە بە ئاسن و ئاگر بەرپەرچیان بدەینەوە.

ئەمە بۆچوونی رِەشزۆ بوو.

سورتک یەکسەر پەسندی کرد و گوتی:

- بەو تەرزەی فەرمووت خوا یار بیت بە زووترین کات کێرمیزیان ناهێڵین.

کەچی زەرف عەقڵی نەگرت و سەری نارەزایی ماوەیەک لەراندەوە و بە دەغەزەوە هەڵیدایە و:

- جەنابتان دەزانن غەنیمەکانمان هەرسێکیان یەک میللەتن ئێمە لە باب و باپیرانمانەوە بۆ ئەوەی یەکتر نەگرن و هەردەم بەسەریاندا زاڵ بین، بۆ سێ گرووپمان دابەش کردوونە. بەمە تارادەیەک سەرکەوتووین. کەچی ئەوەی جەنابتان دەفەرموون دەردەکەوێت بە پێخواسی بەناو کەوتوونە.

هەردووکیان باوەڕیان زۆر بە کارزانی و لێهاتوویی لە هەموو ڕوویەکەوە پێبوو. کەچی عەقڵیان تەواو لە ئەمەیان بڕی نەدەکرد و هەر زوو گوتیان:

- ئەگەر زەحمەت نەبێت ڕای خۆتمان بۆ واژی ناکەیتەوە.

هەوەستی پێ هات و هەر زوو بە ڕالەخۆوە گوتی:

- غەنیمەکانمان نزیکەی چل ملیۆن دەبن، پێم نابێژن چۆن دەتوانین لەم سەدە جەنجاڵە و چاوتیژ و بە حەزەرەدا نێرەوزیان نەهێڵین.

بە دیقەتدانی دەموچاویانەوە گوتی:

- ئەو زەمان بەسەر چوو هۆ بابینە چەشنی پێشوو لەنێو ئەشکەوتان ئاگریان تێبەر بدەین، یان زندەبەچاڵیان بکەین، هیچ کەس گوێی پێ نەدات.

سورتک یەکسەر عەقڵی بۆچوونەکەی گرت و گوتی:

- خۆ.. ڕاست دەکەیت!.

ڕەشزۆ زانی بۆچوونەکە ڕەوایە، سکوتی لا هەموار بوو.

دوای دەمێک دامان و بیرکردنەوە گوتیان:

- ئێمە بیرمان لەمە زیاتر بڕ ناکات، ئەدی جەنابت بۆچوونی خۆتمان بۆ واڵا ناکەیتەوە؟

کەیفی پێ هات کە لە ئاستیاندا سەرکەوت.

تۆزێک لە ناخەوە پراوەی کرد و جا زاری پچڕی و:

- بە بۆچوونی من هەرچەند لەگەڵیان بە ئاگر و ئاسن بجەنگین و بیانچەوسێنینەوە، لە ڕووواڵەتدا جموجۆڵیان زۆر کز دەبێت، کەچی لە ڕاستیدا هەرگیزاوهەرگیز لەناو ناچن و دەستبەرداری خەبات و تێکۆشانی دژمان بە هیچ شێویەک نابن و هەر هەند بۆرە هەلێکیان بۆ بڕەخسێت بە باوکی ئێمە داناسەکێنینەوە.

لە ناخی هەردووکیانەوە سەقا درا و هەر ئەوسات سەری

تەوازوویان، بە سۆزەوە بۆ دانواند و گوتیان:

- ئەی چارە؟!. خۆ هەر ئاوا دەستەوەستانمان بۆ ناچێتە سەر و ئەگەر ئحمێکیـان بـۆ نەکەیـن دوا ڕۆژ لەسـەرمان دەبـنە کەڵەگا.

- ئەمە گوتنی ناوێت.

ئەمەی لە ناخەوە پێ خۆش بوو و دوای ماوەیەک دامـان و بیرکردنەوە بە زەردەخەنەوە گوتی:

- یەکەم: بە ڕای من سەری مارەکە لە کوانی یەکەمدایە و گریمان بەسـەر جموجـۆڵی بە گـوڕ و شـەوقەوەی باشـوایان زاڵ بـین. ئەوانـی دی تەرزی بەفـری گەرمـادیتە بە خۆیـان دەتوێنەوەوە.

دووەم: لە بەرژەوەنـــدیی ئـــێمەدایە، بە ئاشـــکرا ڕێـــگەی جموحۆڵی سیاسی و چەکدارییان بدەین.

هێشتا تەواوی نەکردبوو هەردووکیـان گەلێـک پـێ قـڕس بوون و لە ناخەوە زۆریان بوغزاند و.. بەرگوێیان پرتاند و:

- ئەوەی جەنابت دەفەرموویت دەبێ خۆمان هاندەریان بین و غیرەتی دەسوەکەرییان بدەینە بەر، هەتـاکو ترسـیان لێمـان بشکێت و بە زووترین کات قاومان بدەن.

حسـیا هێنـدەیان لە گـوریس نەنـاوە، بـۆیە خـۆی گـورگە هەڵنەخست و بە زەردەخەنەیەکی تەڵخەوە......

هەر کە ئەمەیـــان لـــێ بیســـت یەکســـەر فســـبوونەوە و بە

شانازییەوە سەری تەوازوویان بۆ دانەواند:

- بەڵام پێویســــــتە بەردەوام بە نهێنـــــــی وا بکەیــــــن، جڵەودارەکانیان لە ژێر دەسەڵاتی ئێمەدا بە هیچ شێوەیەک دەرنەچن. واتە گرج و شۆڕی هەوساریان هەردەم لە دەست ئێمەدا بێت و هەنگاوێکی گچکەشیان بەبێ فەرمانی ئێمە پێ نەهاویشترێت.

بە بافرەیەکەوە... بۆ هەردووکیانی ڕووانی و گوتی:

ئەوســا گریمــان بەرهەمیشــیان ببێــت، هەرگیــز دژی بەرژەوەندیی ئێمە نابێت، بگرە جگە زەرەر و زیان، سوودی مرتەیەکیان بۆ میللەتی خۆشیان نابێت.

سورتک هەر کە حاڵی بوو یەکسەر شاگەشکە دایگرت و بە ڕەوای خەملاند و گوتی:

- زۆر سوپاس بۆ ئەو بۆچوونە پیرۆز و ڕەندەت!، کە مێشکی ئێمەی بڕی کەم و زۆر بۆ نەدەبرد و.. وای کرد شتێکی زۆر مەزن و پیرۆز لەم ڕووەوە، بۆ یەکەم جار لە ناخمەوە چەقێلە دەر بکات.

ئەوانیش بە حەیرمانی موشتاقەوە سێرەیان لە زاری گرت.

بە ڕوویەکی گەش و عوبایەوە گوتی:

- برایان کاتی خۆی پێش چەندین ساڵ باب و باپیرانی ئێمە دوو ڕێبازی ((ئایین))یان بۆ بەرژەوەندی و چەسپاندنی حوکمی خۆیــان لە کــوانی یەکەمــدا بە چەشــنێکی وا

دامەزراندووە، گریمـان دوارۆژ زۆر بەهێـزیش بـن، بە هـیچ جۆرێک نەتوانن یەکتر بۆ بەرژەوەندیی میللەتەکەیان بگرن.
بافرەی شیاو دەموچاوی داگرت و باگۆی داوە و گوتی:
- هەتـا ئەمـڕۆی حـازریش لە ژێـر دەسـەڵاتی ئـێمە دەرنەچـوونە و دەریـش نـاچن و هەردەمـیش بە پیکمـان سێجڕتیانە هەڵدەپەڕن.
زەرف پێشتر بیستبووی و چاکیشـی دەناسین، هەر زوو لە زاری گەیشت و زۆری پێ گوشاد بوو و نەیهێشـت تەواوی بکـات و بەوپەڕی گـوراح خۆشـییەوە زاری کـردەوە و گوتی:
- کەواتە بەو بۆچـوونە زەنگیـنەی جەنـابتەوە بـۆ ئـێمە کۆزوشەش هەڵکەوتووە!
گەشکە ڕووی زیاتر داگرت و:
- ئەوانەی مەرامـمـان بـوون، بـێ شـەکەتی تەقەڵا بە ئاسانی دۆزرانەوە و لە هەنووکەش زووتر نییە هەوڵ بـدەین سەرکردەکانیان لەم دوولایەنەی فەرمووت بەدەر نەبن.
گشتیان دڵسـۆزانە، دوای هـێن و منهـێن و کێشمەکێشـێکی زۆری چەند ڕۆژی نێوان، بە فیتی هەموو لایان دوو کەسـی دەمهەراشـی ڕێبازەکانیـان ((میـرزا)) و ((پیـرزا)) لە نێـوان نەتەوەی باشوایان دەستنیشان کران. بیلبتوون کەیفساز بوون.
هەردووکیان خەنی دایگرتن و لە خۆشیان حاجی فاتمـانە

هەڵدەپەڕین و لایان وابوو تازە هاتوونەتە دنیای ڕوونەوە.

کەچی پەیوەستدارەکانی باشوا هەر زوو بە ڕووگرژییەوە زیتبوونەوە و گوتیان:

- ئێمە مەرجی تایبەتیی خۆمان هەیە، ئەگەرنا خواستتان کەم و زۆر بەجێ ناهێنین.

بۆ.. وەدەستهێنانی ئاواتەکەیان بە ڕوویێکی بافرەدارەوە گوتیان:

- مەرجی ئێوە بە چاوان.

- گریمان هەردووکیان بە ناوەکانیان بچنە مەیدان، هیچ کەس پێ ناحسێت بەرهەمی ئێمەیە. بۆیە بە پێویستی دەخەملێنین، بە لەقەبەکانیان کە بەهۆی ئینتیمایان بۆ ڕێبازەکانمان بە دوایان کەوتوونە.

- گودڵە = میرزا ڕیشە = پیرزا. بانگ بکرێن.

تێکڕا سەری تەوازوویان بە شانازییەوە هەر ئەودەم بۆ مەرامەکەیان داهێنا.

ئەوانیش شادی و سەرفرازی یەکسەر دایگرتن.

***

## گودڵە و ڕیشە

هەردووکیان زۆر پێ کەیفداربوون بەو پلە ناکاوییەی لە لایەن سەرکردەی داگییەکانەوە پێیان بەخشرا.

ئەمەش بە خەیاڵی بابەلبابیشیان گوزەری نەکردبوو. لایان وابوو تازە لە کۆڕی ژیاندا چاوی ڕوونیان تروکاندووە. دنیاش لە ئاست حەزی خواستیان سەرتاپا مێرگێکی سەوزی تۆخی بەهارێکی تەڕ و لەپێشە و بیست و چوار سەعات لە خۆشییان تەرحی کوڕ و کچێکی تازە دڵ بە یەکتر درا قۆڵ لە قۆڵ هەڵکێشراو، هەلەکەسەمایان بوو. لنگیان عەردی نەدەگرت و دەمیان هەردەم قولانجێک بەش و سمێڵە خچکەشیان هەرگیز لێ نەدەبڕا.

ناحەقیش نەبوون هەتا ئەو ساتە نەک کەس گووی بە کڵاویان نەدەپێوا، بگرە ناویان لە کودیلەی تەڕیشدا نەبوو. ئەمڕۆش وا بە کونفەیەکونێک بوونە میرپەنجۆی زەمانە.

شەو و ڕۆژ جووتە برایانە بەیەکەوەیان دەگوزەراند و سوێندیان بە سەری یەکتر دەخوارد و هەر جەم لە ماڵێک دەخورا.

مەگەر کاتی نووستنی نێو خێزانی، دەنا هەرگیز لە یەکتر دانەبڕان.

بۆ بەیانی هەرکە ئاوقافی یەکتر دەبوونەوە، ئامێزی خۆشەویستیی ئاشقەوماشقانەیان، لە دوورەوە بۆ یەکتر دەگرتەوە و بە گوڕ و شەوقەوە ڕدێن و کەزیی یەکتریان دوو سێ جار.. ڕادەمووسی و گودلە گوتی:

- کاکە بڕوا بکە ئەمشۆ دوور لە جەنابت عەجمانم لێ هەرگیرا و هەتا شەبەقی بەیان خەو تخوونی چاوم نەکەوت.

- کاکە دڵ ئاگای لە دڵە و بەسەری تۆ قەسەم کە گەورەترین سوێندە لام، منیش لە جەنابت خراتربووم.

زوو زوو دەست لە نێو دەست و خۆشگوراحانە سەردانی داگییەکانیان دەکرد، سەد هێسترێک زیاتر دەما بگەنە لایان.

بە خولق خۆشییەکی زۆرەوە پێشوازی دەکران.

ئەوانیش بەوپەڕی سۆز و هەستی مرۆیاتییەوە سەری تەوازوویان، بە پل گەیاندنە زەوی و پاشەڵ لە یەکتر ترازانەوە بۆ دادەنواند.

***

باشواکان ئەو تەرزە ڕێز و خۆشەویستەیان لە کۆڕی ژیاندا هەرگیز نەدیبوو، عاجباتییان پێ دەهات و:

- گودلە و ڕیشە و ئەو جۆرە ئەڤینییە کوجا مەرحەبا.

کە پێشتر هەرگیز ئاویان لە بنۆڕەی یەکتر نەدەخواردەوە.

هەر کە بەردەوام بوو ئێرەییان پێ دەبردن و بە دەست بڵندکردنی پاڕانەوە دەیانگوت:

- یەزدانی مەزن لە تێری ناحەز و چاووزاریان دوورخات و هەر ئاوا لەم سەرفرازییەدا بەردەوام بن و نێوانیان بە هیچ شێوەیەک لەکەدار نەبێت، کە بە لای بەرژەوەندیی هەموو لایەکمان دەشکێتەوە.

نەخاسمە ((مام شێخ)) ئەوەندەی کەیف پێ دەهات و خۆشی دەویستن لە باس نایەت و هەر ئەوەتە سەلاواتی لەسەر لێ نەدەدان و پڕ بە زار دەینەڕاند و دەیگوت:

- هەر بژی بەرپرسە تێکۆشەرەکانمان.

- هەر بژی سەرکردە نوێیەکانی شۆڕشە پیرۆز و مەزنەکەمان.

- هەر بژی ڕابەری ئازادی و سەربەخۆیی و پێشکەوتنمان.

* * *

تەنیا پیرمۆتـک نەبێـت، پیـاوێکی لاواز و بـێ داروبـار و کورتەبنە و ڕەنگ سپی و سوور و جوان و ڕیش چەرمـوو، بە پێچەوانەوە هەردەم گاڵتەی پێ دەهات و بە کەفوکـوڵەوە قاری لێ دەخواردن و لە ناخەوە دەیمنگاند و:

- حوشـتر بگـرە خەت پیشـەم نەبـووە قەت: گـودلە و ڕیشەی دەسـکرد ببـنە سـالاری هەوڵ و کۆششـمان حاڵمـان زۆر چاک دەبێت. نەخاسمە هەرکە هوتافە بەگوڕەکانی مام شێخی لە گوێی دەزرینگانەوە هاروهاج دەبوو.. و لە شـروی بێدەسـەڵاتییەوە هەر جـارێ حریتەیەکـی حێلـی وای ئاوقـا دەبـوو لە دوورەوە دەبیسـترا و ئـاو لە چـاوانی زرچەی بە گوڕەوە دەبەستا.

کەچـی نەبـادا دەنگـی ببیسـترێت لەگەڵیـان ئەوسـا بـکەونە کۆنگرەیەکی بێسوودەوە، هێوری دەکردەوە:

- ئاگر و پووش، مەڕ و گـورگ، مشـک و پشـیلە لە نێو زریان و وەیشـوومەی کارەسـاتی ژیانـدا بە یەکەوە هەڵ بکەن، ئاخری زمانە.

هەر کە کەیفسـازیی بەردەوامـی خەڵـکەکەی، تـایبەت مـام شـێخی ڕۆژانە دەدیـت، گریـانی بە نەزانـین و خەشـیمی و عەقڵ قوڕەییانی دەهات و سەری غەزەبی دەلەرانـدەوە و لە ئەنجامـدا هەر چەنـدی کـردی و کۆشـا، نەیتـوانی دان بە خۆیـدا بگرێـت و نەجمـانی زاری لە ئاسـتیدا بە تـاوان و خیانەتی دەقڕساند.

- گریمان بێدەنگ بم، سبەی وەکات بەرژەوەندیی خاک و میللەتەکەم دەکەوتە بەردەستیانەوە و ئەمەش خیانەتێکی بە بارە بارە.

هەر زوو تەرحی "هەنار بۆ نەخۆش" بیات بە گوڕەوە ئاوقای ڕووبەڕووی ناوبراو بوو و بێ پەردە بە ڕووی هەڵزەقییەوە و گوتی:

- ئەرێ پێم ناڵێیت کامیان ڕاستە!؟

یەکسەر لەبن زاری حاڵیبوو و بە پەرۆشەوە لە سەروسەکوتی ڕووانی تا بزانێت چ شەکر دەشکێنێت.

ئەویش لە ڕەنگپەڕینەوە مەرامی حاڵیبوو.. و گوێی پێ نەدا و گوتی:

- ڕیشی پانی پڕ ئەسپێ، یاخۆ کەزی و بسکی ژنانی.

حسیابوو لەمێژە دغدغەی دژایەتی هەیە، بەڵام هەرگیز نەیدەزانی بەم تەرزەیە و مەرامی دووانەکەی گاڵتەجاڕییە و لەگەڵ شینومۆر هەڵگەڕان و چاو لە مۆڵەق وەستاو.. وەک کۆلەمستێک ئاراستەی دەم و لەوسی بکرێت و بە هەڵچوونەوە:

- بۆ جەنابت هەرگیز نەهاتووە ئەو قسە لاتڕقەوچانە لە ئاست سەرکردە مەزنەکانمان هەڵبەستیت.

بە مەزەبی نەک تاوانە، بگرە بە کوفرێکی گەورەی دەچوواند.

بە وتە قاییمەکەیەوە غەزەبەکەی تۆزێک هێور بووەوە.

گەرچی یەکیانی بە دوژمنی سەرەکیی خۆی دەژمارد و شەو و ڕۆژ نەفرەتی حەواڵە دەکرد. کەچی بۆ ئەوەی پێی داخدار بێت و جارێکی تر پێی ئاوا نارەوایانە خوار دانەنێت، نەخەسەڵە لە ئاست خۆشەویستەکەی، پێچەوانەی هەڵوێستەکەی:

- هەردووکیان لەوپەڕی مەزنی و پایەبەرزیدانە و جیاوازییان بۆ سونەتیشی نییە، بەس من یەکیانم خۆش دەوێت، هەردەم بە باڵای هەڵ دەدەم، کەچی بە درۆیەکی زەقەوە نەفرەت لە ئەویتریان دەکەم، تۆش بە بەرەواژییەوە. بۆیە پێویست ناکات. من ماوەیەکە ئاگادارم جەنابت لە ئاستیاندا ناوە ناوە قسەی لاتڕقەوج و بوختانیان بۆ هەڵ دەبەستێت.

دەیزانی چیتر لەگەڵی پێدا بچێت دۆ و دۆشاو تێکەڵ دەکات و دەبێتە لە یەکترترازانێکی یەکجارەکی. خۆی بە ئەنقەست فس کردەوە و گوتی:

- با لەگەڵ ئەو کەودەری و بەرژەوەندارە نەکەومە نێو گەوەڕی نەزانینەوە. ئەگەرنا ڕەش و سپی و ڕاست و چەوت هەرگیز بە یەکەوە ناگونجێن.

***

هەر سێکیان بە موشتاقەوە هەوڵیان بە یەکەوە دەدا هەردووکیان وا بەهێز بکەن پاشەڕۆژ بە تەقەلا و کۆششی

زۆر و بەردەوامـــی باشـــوایان هەرگیـــز جـێلەق نەبـــن، بـــا تاوانیشیان لە ئەندازە بەدەر زۆر و خیانەتیش بێت.

چەک و عیتـــادێکی زۆریـــان پـــێ بەخشـــین و پـــارەش کلاشەی دەکرد.

وێـــڕای ئەوەش پەســـاپۆرتی ســـەر ســـەلامەتییان لە کاربەدەســـتانی هەر ســـێ کـــوانەوە قەزمەنووشـــتیانەیان لە پەڕەکەی سکۆلەی چەپی دڵیانەوە قرمساند.

هەرکە ئەو ئاوەیان لە هەموو ڕوویێکەوە بۆ ڕژا و پـارووی سەرســـــەلامەتییان کەوتە ڕۆنێکـــــــی وا بە خەیـــــاڵی ئەژدادیشـــیانەوە گـــوزەری نەکردبـــوو. بە پێـــودانی خۆیـــان دانەدەسەکنان و سێبەری خۆیان زۆر گەورە دەهاتە بەرچـاو. وارەوارەبای غروورییان کەوتە کەوڵەوە. چ غـروورییەک لە نێو هەموو چڕگەیەکدا بەیەکەوە روو نەدەنیشتن و لە هەموو جەوەندەیەک ئاویان نەدەخواردەوە. هەتـا وای لـێ هـات لە قەپێلکی خۆیان دەربچـن و بـۆ بـاری تایەنیـان بگەڕێـنەوە و هەریەکەیـــان خـــۆی بە میرپەنجـــۆی زەمـــانە دەقەبڵانـــد و هاوڕێکەشی بانگۆڵەی ژێر گڕوێلان.

سات بە سات زیاتر دەهەنگڕان و ناکۆکییەکەش تەشەنەی دەکرد و لە یەکتر هێدی هێدی دوور دەکەوتنەوە.

هەر ئەوەتە، تەرزی نێـرەکەری سـۆری دەشـتی هەولێـر.. ڕووبەڕووی یەکتر نەدەزەڕین.

هەریەکەشیان پشتی نامۆیی بە مهانەی جاش و خیـانەت لە ئەویتر کرد.

وای لێ هات یاغر یـاغر لە یەکتـر دابـڕێن. هەتـا کـار لە کار ترازا و نەیاندەتوانی ساتێک ڕوو بە ڕوو چاو لە چـاوی یەکتر پشوو بدەن.

تاکو سەری ئەنجامەکە بۆ لەناوبردنی کەسانی بـێ چەکـی لایەنگیری یەکتر، بە ئاشکرا پەلەواژ بکەنەوە، هەڵکێشا.

ڕیشـە دەستپێشـخەری کـرد و دوو کەسـی دەسـوالای لە نـوێنەرانی گـودلە، بە نـوێژی نیـوەڕۆ و لە چەقـی بـازاڕدا بەرگولان دا.

ئەمە گـودلەی هاروهـاج کـرد و قـراری لـێ بـڕاو دوای چەنـد ڕۆژێـک دوو سـێیەکی لە دۆسـتانی ئەوی بە هەمـان شێوە پەلەواژ کردنەوە.

پێنج و دوو ڕۆژی نەبرد، دەستیان بە جارێـک لە خـوێنی یەکتر سوورکرد و ڕۆژ نەبوو خوێن لە نێوانیاندا نەڕژێت.

هەردوولا بە کوشتنی لایەنگیری خۆیان هەردەم کەیفسـاز دەبـوون و خەنـی دایـدەگرتن و هەر ئەوەتە سـێجرتیانە هەڵنەدەپەڕین و:

- ئەوانەی دەکـوژرێن کەسـوکاریان ناچـار دەبـن بە شەوقەوە بینە لایەنگیری گیانی بە گیانی هەتاهەتایەمان.

غەرەزیش لە چوونە قەلات دۆلمە خواردنە. بۆیە بە هەستێکی تەژی مەراقەوە سەریان بۆ کوشتن دەخورا. گریمان یەک دوو مانگ کوشتن نەبووایە، خەم و پەژارە دایدەگرتن.

داد و فیغانی خاوەن کوژراوەکانیان بە قیروسیا دەچوواند.

دوای چەند وەختان هەردوولا دلنیابوون ئەگەر ئاوا بڕوات خوێن لە نێوانیاندا سەرکان دەبات و ئەوسا لەگینە گیانی خۆشیان، کە لە بەرایی هەموو شتێکە بکەوێتە مەترسییەوە و بەرپەرچدانەوەشی زۆر ئاسان نابێت.

ڕۆژ ڕۆژی ئاوقابوونی ئاواتە سەرەکییەکەی داگییەکان بوو و بە فیتی هەرسێکیان ئامێزی خۆشەویستی و پشتگیری لە ڕادەبەدەری ڕەشزۆ بۆ گودلە و زەرفیش بۆ ڕیشە، بە هاوکاری سورتکەوە گرتەوە.

هەردوولا لەگەڵ ئۆقرەگرتنیان دەنێو نارچەی مکووم و چەسپیوی جاشکانی و لەسەر ئاخوڕی چەوری پشتی سەلامەتی، گیانی خۆیان کردەوە و ئەمە هانیدان لەسەر دژایەتییەکەیان بە سۆز و ڕشتر بن.

***

**پیرمۆتک:**

ناوە ناوە بە هەڵسوکەوتی گودلە و ڕیشەوە سەری نارەزایی بادەدا و لە ناخەوە دەیدابەرێ و:

- ئێمە بە هەموو توانامانەوە هەوڵمان دا لە ژێر کوتەکی کوشندەی ڕەشزۆی داگیرەش دەربازبین، کەچی لە سایەی گودلە و ڕیشەی دەسکردەوە، هەستی نیشتمانیمان بەربای هورەوە درا و ئەوجا دوای کوشتن و بڕین و دەربەدەرییەکی لەڕادەبەدەر زۆرەوە یەکیان خۆی بە کەیف و ماشای شەوقی قایشوقرۆش و دەستوپێوەندەوە هاوێشتە کۆشە گەرم و نەرمەکەی ڕەشزۆوە و ئەویتریش بە پێچەوانە و ڕووێکی گەش و عوبابی نزیک لە قەپێلکی موزەییەفی هەستی نیشتمانی و دوور لە خەجاڵەتی جاشکاتییەوە، بە شانازی و بافرەدارییەوە ئاوێزانی بەرۆکی زەرفەوە بوو.

***

سـەنگەری خۆچەسـپاندنیان لەسـەر لێـواری ڕووبـارەکەی نێوانیانـدا دامەزارنـد و بیسـت و چـوار سـەعات یەکتریـان بەردومان دەکرد و هەریەکەیان تۆمەتی خیانەت و جاشـاتی دەدا پاڵ ئەویتر.

ڕۆژ نەبوو خەڵکی ئەملاوئەولای لابەلا نەکوژرێن.

مام شێخ ئەوەندە خۆشحاڵ بوو نەبێتەوە. لای وابـوو تـازە چـاوی لە دنیـای ڕوونـدا تررووکانـدووە سـمێڵە خچـکەی هەردەم لـــێ نەدەبـــڕا. بەوپەڕی شـــانازییەوە بە ڕووی پیرمۆتکەوە، کە دەیزانی پێ داخدار دەبێت، هەڵشاخا و:

- سوپاس بـۆ خـوای مەزن ئەمـڕۆ وا پـاک و پـیس، نیشتمانپەروەر و خائین، پێشمەرگە و جـاش بە یەکجـاری لە یەکتـر هـاوێر بـوون. ئەمەش هیمـایە و شـاڵلا بەم زووانە، بە هیممەتـــی دەســـتوبازووی پێشـــمەرگە گیـــان لەســـەر دەستەکانمانەوە بە ئاواتە سـرکەکەی خۆمـان بگەیـن و گەل و نیشتمانەکەمان بە یەکجاری بحەسێنەوە و ئەوسـا بێگومـان دەتوانین بە بەردی نەفرەتان گودلەی جاشی خائین، بۆ هەتـا هەتایە شاربەدەر بکەین.

پیرمۆتک زەردەیەکی هاتێ و نەیویست بیدوێنێت و لێیـان ببێتە مشتومڕی بـێ سـوود. بـۆیە بـێ مـرتە سـەری بە خـۆدا شۆڕکردەوە.

ئەو حسیا شتێکی دژی لایە و نایەوێـت بیـدرکێنێت، بـۆیە

هەر زوو زاری پچڕی و گوتی:

- بۆ.. وا بێدەنگ بوویت؟

بزەیەک ڕووی داگرت و هەڵی دایە و گوتی:

- چیم لا نەماوە بیڵێم. جەنابت دوێنێ بەرگریت بەوپەڕی شەوقەوە لە هەردوولا دەکرد، کەچی ئەمڕۆ.. وا گێڕت گۆڕیوە و یەکیانت بە باش داناوە و ئەویتریش جاش.

کەمێک ڕەنگی بە دامانەوە پەڕی و پاشان دەمی بەم تەرزە کردەوە و گوتی:

- ڕاست دەکەی.. بۆ ئەوەم بوو بەرپەرچی هەڵوێستە چەوتەکەی جەنابت بدەمەوە، ئەگەرنا ئەوساش هەر ئەو هەڵوێستە پیرۆزەی ئێستام هەبوو.

هەر کە ئەمەی لێ بیست لە ژێرەوە پێکەنینی پێ هات، کەچی لەبەر ڕاگرتنی دڵی، دەری نەخست و بە شێوەیەکی ئاساییەوە، دەشیزانی پێ بافرەدار دەبێت گوتی:

- گودلە حەوجە بە بەڵگە ناکات عەرەب و عەجەم دەزانن خۆی و دەستوپێوەندیەکانی کردووتە جاشێکی لچکراوی ژێر دەستی ڕەشزۆوە.

هەوەستی زۆر پێ هات و.. ویستی زار لەم ڕووەوە هەڵێنێت، کەچی ئەو نۆرەی نەدا و بۆ ئەوەی بن زمانی تەواو بۆ واڵا بێتەوە و:

- من لەم ڕووەوە سەرم تەواو دەرناچێت. بۆیە پێم خۆشە

ڕای جەنابت لە ئاست بیروبۆچوونی ڕیشەوە بزانم.

پێشتر هەڵوێستەکەی لە دڵ چەکەرەی کردبوو و بە زەندیقی ملەوەزی لەقەڵەم دەدا و بۆیە پرسیارەکەی خستە ژێر باری گاڵتەوە، کەچی گوتی:

- ئێ .. هـ پیر مۆتکە و بەڵکی خواوڕاسان دەکات لەو بیروبۆچوونە پووچەی چەند ساڵەی پاشگەز بوویێتەوە، کە ئاواتی هەرەگەورەی بوو. بە ڕوویێکی گەشی بافرەداوە گوتی:

- ئێمەی باشوا گیانێکمان بە ڕیشە و پێشمەرگەکانێتی کە دوا ڕۆژ لەژێر کوتەکی جەور و ستەمی ڕەشزۆی داگیرکەرمان دەرباز دەکات.

ویستی لە حیلکە بدات، کەچی دڵنیا بوو مام شێخ بە غەزەبەوە بەرەنگاری دەبێت.

ئەمە دەلحاز سستی کردەوە و بە هێدییەوە گوتی:

- ئەردی ڕات بەرامبەر زەرف چۆنە؟

حسیا مەرامی چییە و نەبادا بیداتە بەر پلاری تەنزەوە، نەیتوانی خۆی لە پینەوپەڕۆیان لەم ڕووەوە هەڵواسێت و بەم چەشنە زاری پچڕی و گوتی:

- ئەویش لە هەموو ڕوویێکەوە هاونیری ڕەشزۆیە.

داننان بە ڕاستییەکە کەیفداری کرد و لە ناخەوەش باوەڕی

کزبوو و دەیزانی لێی دوورە و بۆ یەکلاییەوە گوتی:

- کەواتە چ حەســـەن کەچەر، چ کەچەر حەســـەن هەر یەکە.

بێ سێ و دوو گوتی:

- ئەوە گوتنی ناوێت.

دەمێک خۆی بە دامانەوە بوارد. پاشدان تانیـدا بەر خـۆی و بە هەستێکی تەژی جورئەت و قیروسیاوە گوتی:

- کەواتە لە دڵم سەقا درا و هێزیش نییە جێلەقی بکات......

چاوی بە دیقەتەوە لە چاوە زەقەکانی بڕی و:

- ئێوەش لە سایەی ڕیشە و دارودەستەکەی دەگـوزەرێن، بێ پەردە جاش و گۆردەی ئەوبەرن.

هاروهاج بوو و کەفی قار و تووڕەیی لە لا لغاوەکـانی، بـێ خوایشتی و هەستیش پێ بکات سەری هەڵدا و بە دەنگێکی حێلەوە نەڕاندی و گوتی:

- قولەمەیتەری ئاخری زەمان، تۆ وات لێ هات پەتکی ئاوا مەکروفـانە لە ئاســت ســەرکردەی شۆڕشــە مەزنەکەمــان بەردەیتەوە.

دوای ســڕینەوەی تەڕاتــی لێوەکــانی و هەتــا ئەوســاتەش قارەکەی تۆزێک هێور بووبووەوە.

- بە ڕاســتی شــەرمم بەخـۆیە ئەگەرنـا لە ســەر ئەو قســە

تڕووهاتانەت هەر هەنووکە خۆم لەگەڵت یەکلا دەکردەوە.
بۆ ئەوەی لەگەڵی تێک نەگیرێت، بە هەستێکی کزەوە هەنگاوی ڕۆیشتنی ناو ماڵە دەروونەوە بداتەبەرێ و:

- با لەگەڵ ئەو نەزان و بیرتەسک و تڕزلە نەکەومە نێو چاڵە گورگی گێرە شێویێنیی نەزانینەوە.

***

هەرکە ڕیشە واریقاتی سوارەی خزمی لەوبەر بەر گوێ کەوت، شێت و هاربوو و سێ ڕۆژی نەبرد تاس و حەمامەکەی ئەوی بە موشتاقەوە دامەزراند.

زانا و زەردەشت و دووسێ چەکداریان لە سێباری نیوە شەوێکدا پیاوێکیان ژناوژن لەوبەر چنگ لەسەر چنگ هێنا و زانا دەستپێشخەری کرد و گوتی:

- سەرۆک ئەو خائینەی دەناسیت؟!.

ناسی.. چەتۆی دەستوپێوەندی گودلەیە و لەناخەوە شادی دایگرت و تاکو تێ بچۆلێت گوتی:

- نەخێر نایناسم.

- گەورەم ئەو خائینە ناوی چەتۆیە و خزمی گودلەی جاشی خائینە و گووێکی یەکجار زۆر گەورەی دەرحەق جەنابت خواردووە، کەچی من هەر چەند تان لە خۆم دەدەم تاسا ناکەم بیدەرێنم.

- حا... هـ !

زەردەشت لەم ڕووەوە بە جورئەتتر بوو و گوتی:

- ئەو خائینە ناکەسبەچەیە پێی لە قەدەر بەرەی خۆی زۆر زیاتر ڕاکێشاوە و لە نێو کۆمەڵە کەسێکدا گوتوویەتی:

- ڕیشە کچێکی ئەوەندە جوان و کەحێلی هەیە، هەتا برای خۆشی تەماعی تێ دەکات.

چاوی ڕقـی چـووە پشتەسـەر و لەجیـاتی زارهەڵبڕینـی پرمەیەکی وڵاخانەی لێوە هـات و پڕووشـکە کەف لە زاری دەرپەڕی و دوای ماوەیەک بەسەربادانی قارەوە گوتی:

- پێم ناڵێن: ئێوە ئەمەتان چۆن زانیوە؟!.

- گەورەم ئەندامانی حیزبەکەمانی ئەوبەر لە دیار بوونە.

بە ڕووی مڕومۆچ و دەنگی حێلەوە گوتی:

- کەواتە ئەو خـائینە لەسـەر ئەو گووخـواردنەی شـیاوی ئەوەیە بە شێوەیەکی وا بتۆپێندرێت، بە خەیـاڵی هـیچ کەس گوزەری نەکردبێت.

هەر ئەو شەوە فەرمانی دا ڕووتیان کردەوە و لەسەر زگیان ڕاکشاند و هەر چوار پەلیان لە سینگ شـەتەك دا و ئەوجا سێ قۆندەرەی لاستیقیان لەسەر پشت تواندەوە.

لەتاو ئەو دەردە کوشندەیەوە هەتا چەند خولەکێک زیرە و هاتوهـاوار و ڕۆڕۆی دەگەیشـتە کەشـکەڵانی حەواوە، بە جۆرێك شـەیتانی لەعینـیش لەدیـاربووایە هەسـتی بەزەیـی و زگپێسووتان دەیهەژاند و بێ خوایشـتی خـۆیەوە لە هـۆڕژنی گریانی دەدا.

- ئای.. بابەڕۆ سووتام.

- ئای.. بابەڕۆ مردم.

- کوڕە بۆ خاتری خوا تۆزێک بەزەییتان پێمدا بێتەوە!.

- کوڕە دەستم دامێنتان کەمێک ڕەحمم پێ بکەن!.

بێ سوود بوو و لەگەڵ پڕمەی گریانەوە لە ئەمانەی زیاتر بۆ نەگوترا:

- وەیڕۆ.. بابەڕۆ..

- وەیڕۆ.. براڕۆ..

- وەیڕۆ.. لە خۆم قەلەندەرێ ڕۆ.

کەچی غەنیمەکانی دەوروبەری بە بەرەواژییەوە شادی بەسەریاندا زاڵ بوو و حریتەحریتی هێندێکیان دە سەدە هێستر دوور دەبیسترا.

گوستانی خێزانی هەر کە شەو بەسەریاندا درا، یەک دووانێکیانی دەناسی خوبزەی ڕیشەنە هەر ئەو شەوە بەدوایاندا پەڕییەوە، بەڵام هەتا گەیشتە لایان کار لە کار ترازابوو. کەمێک بەرامبەر دیمەنە دزێوەکە بە حەپەسان و زار لەواشەکراو وەستا و بۆی ڕووانی و زۆری نەبرد لەتاوان لەسەرڕا تەپەی هات و دوو سێ دەقیقە لەخۆچوو. کە بەخۆ هاتەوە دەمێک سێرەی قڕوقەپانەی لە تەرمەکە گرتەوە و جا لەرزووکەیەکی وای دا، لە باس نایەت. لەگەڵ چەپەلۆک دادان بەسەر پۆتەلاکی خۆیەوە و گوتی:

- و..ی، و..ی، و..ی، و..ی، و..ی.. .. .. .. .. ..

هەتا تۆزێک داکەوتەوە. چی هاتە سەرزاری و نەیگێڕایەوە:

- هەی کـــافرینە.. هەی زەنـــدەقینە.. بـــێ مـــروەتینە.. فەرمەسۆنینە.. گۆردەی هەر سێ داگیبەکان.......

پشووسواری تۆزێکی وەستاند و گوتی:

- تەنیـــا هەرلەبەر ناوهێنـــانی کچەشـــاران گەڕ و داوێنتەبەڕاکەی........

بەدەست ئاماژەی بۆ کرد و گوتی:

- ئەو خائینە. ئەو خوێنڕێژە. ئەو جاشە.........

زانا نەیهێشت تەواوی بکات هەتـا قەمە گرتـی لە هەنـاوی خەتم کرد.

ڕیشـــە هەر کە ئەمەی دیـــت، هەر زوو فەرمـــانی دا و دەڤەرەکە چۆڵ کرا، تەنیا دوو تەرمەکە نەبێت.

زانـا و زەردەشـت پێشـتر چەنـد بـازنی زێڕیـان لە دەسـت ئافرەتەکە دیبوو و بە دزی گەڕانەوە.

زانا چەند هەوڵی دا بازنەکانی لە دەست بۆ دەرنەهاتن.

زەردەشت گوتی:

- وا دەچم گازێک دەهێنم بیانقرتێنین.

- نا.. نا گەوجە نرخیان زۆر دادەبەزێت.

لەگەڵ بلندکردنی دەستی تەرمەکە گوتی:

- من تەکبیرێکی باشم بۆ هاتووە.

ئەمەی گـوت و بە مـاوەی چەنـد خـولەیەک بەخــ ........

دەری هێنان.

بە بزەیەکەوە گوتی:

- کاری باش بە خۆی دیارە.

زەردەشــت بە عەمــری خــۆی کــاری ئــاوا مەکــرووف و نامرۆیانەی لە ژیاندا نەدیبوو، زۆر پێ قرس بـوو، دگەدگـی غەزەبی لێوە دەهات و چاویشی تـار هەڵـگەڕا و کەچـی کە شەش بازنی بە نسیب بوو، هیچی لەبەر دڵ نەما.

***

گودلە – لەگەڵ سیروان و شێروانی ئەندامی حیزبەکەی کۆبووەوە و زاری بە ڕوویاندا هەڵێنا و گوتی:

- من ئەمڕۆ لە ئێوە دڵسۆزتر شک نابەم، کە بە پێویستی خواستم گوزەر بکەن.

ئەوانیش بەسەر دانواندنەوە گوتیان:

- هەرچی جەنابت دەفەرموویت ئێمە وەک تای تەووړداس بە گیان و ماڵ لە خزمەت وەستاوین.

کەیف قەبرغەی گرت و بە ڕووخۆشییەوە گوتی:

- دەبێ هەردووکتان لەمەودوا وەک نوێژ و ڕۆژی لەسەرتان فەرز بێت، چەشنی خەفیاتی هەردەم لە نێو شار گوزەر بکەن و لە هەرچی دەنگوباسی ڕۆژانە و هەڵوێستی خەڵکەکەیە خۆتانی سرکانە تێ هەڵقورتێنن و بە زووترین کات ئاگادارم بکەن، نەخاسمە کەسێکی لە لاڕا دەرحەق من، یاخۆ کارەکانم پێدرێژیی بە زار، یان بە کردەوە بکات.. تایبەت ئەوانەی هەڵوێستیان لەگەڵ هەڵوێستی من جیان. هەتا چییان دەرحەقمان ئەنجام نەداوە ئێمە زەبری کوشندەی خۆمانیان لە پێشڕا لێ بوەشێنن.

پێنج و دوو ڕۆژی نەبرد سیروان و شێروان چایەچییەکی نێو چەقی شاریان قۆڵبەست کرد و بە سەرە سمک و سیخورمە و پارەسوان هێنا بە بەردەمی و گوتیان:

- ئەو خائینە بەدڕەوشتە سوارەیە و لە نێو گازینۆکەیدا تەنیا بیبسی دەفرۆشێت نەک کۆلا.

پیاوێکی جوامێر و پێدار و بار.

بە نهێنی وەبەرگوێیان چرپاند:

- ئەو خائینە ڕووڕەشە خزمی پشتیی ڕیشەشە.

گودلە هاروهاج بوو و پشکی لەبەر خۆیەوە دەهێنا و بە دەغەزەوە گوتی:

- کوڕە ساختەچی پێمان نالێیت بە چ چاووڕووێک بیبسی بەرهەمی ئەوبەرە و یاسا قەدەغەی کردووە، جەنابیشت بە زەقەزەقی چاوان دەیفرۆشیت نەک کۆلای بەرهەمی خۆیی.

- قوربان جارێ نەمزانیوە قەدەغەیە و خاوەنەکەی بە هەرزان و قەردم دەداتێ هەتا دەیفرۆشم، کەچی کۆلا گرانترە و بە نەقدیشە.

بە هەڵچوونی پترەوە گوتی:

- وادیارە هەستی نیشتمانیت زۆر کزە ئەگەرنا کۆلا بەرهەمی خۆیە و با دووقات گرانتریش بێت دەفرۆشت، نەک بیبسی.

چی لانەما بەرپەرچی بداتەوە، پاشدان ئەمەی بۆ هات و گوتی:

- ئەوەی دەفەرموویت بۆ من هەرگیز دەرناهێنێت.

- زمـانی چەنـد ڕەپە زمـان! لە بریتـی تەوازووخواسـتنەوە ئەوجا مکوڕیشە.

بە دەهرییەوە ڕووی لە خوبزەکانی کرد و گوتی:

- هەتـا چـاوی هیـدیکەی پـێ بشـکێت هەر ئێسـتا بیـبەن ڕووتـی بـکەنەوە، تەنیـا شـەڕواڵی نەبێـت دەلینگەکـانی لە بەلەکی ببەستن و پڕی خـڕکە بەردی بـکەن، دۆخینەکەشـی بە گرێکوێرە لە قەدی شەتەک بـدەن و ئەوجـا بە ڕووبـاری دابدەن.

مـام سـوارە هـۆپێکی لەخـۆ زانـی و لە شـروان چەنـد چرکەیەک زاری بەستراو لە ناخەوە دوا:

- هەنجەت نانە جۆیە و بەس.

ئەوجا بە دەنگێکی بەرزەوە گوتی:

- گەورەم ئەوجارە عەفووم بکەن، مەرجە هەتا ماوم نەهێڵم بیبسی بێتە گازینۆکەم.

لە حریتەیەکی حێلی دا و گوتی:

- دوای باران کەپەنک بەکەڵک چـی دێـت گەلحـۆ. تـازە تۆ خیانەتەکەت ئەنجام داوە و هەتـا لەمەودوا خیـانەتی ئـاوا سەرهەڵنەداتەوە، تۆپاندنت پێویستی سەرشانمانە.

کە دڵنیـابوو دەیکـوژن، زمـانی لە ترسـی مردنـدا بە یەکجاری بەسترا.

ئامادەیان کرد بە ڕووباری دابدەن، گوتی:

- نەبادا ئەو خائینە مەلە بزانێت هەردوو دەستیشی لە پشتەوە ببەستن.

لەگەڵ تێهەڵـدانی بـۆ نـاو ڕووبـارەوە، لێکـڕا ئەوانەی دەوربەریشیان هەتا لەسەر پشت کەوتن پێی شین بوونەوە و:

- پێویستی سەرشانمانە هەرچی خائینە ئاوای بە پەندی ببەین.

***

بەدەست لە پشتدانی ڕەشزۆوە، گودلە چاوئێشانە هەولـی دەدا خـــۆی نەک لە ڕووی چەکەوە، بگـــــرە لە ڕووی ماڵیشەوە وا پێ بگەیەنێت پاشەڕۆژ دانیشتووانی دەڤەرەکە نەتوانن فزەی کەم و زۆر لەبەر بکەن.

زۆربەی ئەندامانی حیزبەکەی چەکدارکردن و تەرحی ئاژان لە چەقی بازاڕ و ڕێگەوبانان شەو و ڕۆژ جرتوفرتیان بوو.

خەڵکی لایدە و عولعولی و عەقڵ قوندە و شاش و فیش وایان دەخەمڵاند بۆ ئەمن و ئاسایشە. کەچی لە ڕاستیدا هەر چاوێکیان کردبووە چوار چاو و ماتیان بۆ بەسەردادانی شەوان خۆش دەکرد.

زۆری نەبرد، شەو نەبوو بەسەر ماڵاندا نەدەن و دووکانان نەبڕن.

ئەو کەلوپەلانەی لە دزین و تالانەوە بە نسیبیان دەبوو، تاکو ئاشکرا نەبێت هەر هەمان شەو بە هۆی سیروان و شێروانەوە، بە بەلەمیان دەپەڕاندەوە و زانا و زەردەشت و خوبزەکانیان دوای پشکنین و نرخاندنیان، لێیان وەردەگرتن، ئەمەش بە فیتی زەرفەوە بوو.

وا دەبوو هێندە کەلوپەل بە زۆری کراس و کەوا و ئاوەڵکراس و دەرپێکورتە و فانیلە و مەمکدانی ئافرەتانیان

لەبەر بێنرخییان ڕەت دەکردنەوە و بە هەڵچوونەوە زاریان دەپچڕاند و:

- پێمان ناڵێن ئا..ئەوانە چینە بۆمان دەهێنن؟!.

- گەلحۆینە کەر مەبن، ئەوانەی دەڵێن ڕاستە بێ ڕەواجن کەچی پارەیەکی زۆریان پێ دراوە و زەرەریش بە غەنیمەکانمان، کە ئاواتی هەردوولامانە دەگەیەنێت.

بەمە سەری، سەلماندنیان بە خوایشتەوە بۆ دانواندن.

ئەگەر شکایەتیش بکرابووایە جگێکی کەنووشی نەدەهێنا.

بێ پەردە دەیانشیراند و:

- چەکدارەکانمان شەو هەتا شەبەقی بەیان سرکانە حەسحەسی شەقام و کۆلانانن و چۆلەکە تاسا ناکات سەر لە کونی خۆی هەڵکێشێت، پێمان ناڵێن کێ توانای دزیکردنی هەیە؟!.

- ئەمەش بەڵگەیەکی زەق و ئاشکرایە کە داواکەتان دوورە لە ڕاستی و نیازتان بەم درۆ زەبەلاحانە تەنیا ڕیسواکردنی کارگێڕانی ئەمەمانانە و بەس.

دوای دەمێک پێندان، هەر کە بۆیان والا بووەوە دەسەلاتی نارەزایی، بە زاری جورئەتەوەش زیت نەبووەوە هەڵیان دایەوە و:

- دەبێ لەمەودوا ئەگەر کەرەتێکی تر درۆی ئاوا بە بارە

بار ئاراستەی دادگا بکرێت، سزایەکی زۆر توندوتیژ بدرێت.

- ئەمەی فەرمووتان باشترین چارەیە.

لەوساکەوە شکایەت و خۆگێفکردنەوە لە توانای کەسانی جەسووریش فڕی.

هەرکە ئەو دزین و ڕاوەڕووتەیان بۆ چووە سەر و لە هیچ لایەکەوە هەست و خوستی لەقە و چەدانەوەیان نەدیت، چاوی تەماعیش هەرگیز تێر نابێت، دەستیان بە دزین و فڕانی ئۆتۆمبێلیان کرد. لە هەوەڵەوە. شەو پێ هەڵدەستان. لە دواییدا ڕۆژیشی گرتەخۆ.

هەتا سڕی دزینەکەیان تەبەڕا نەبێت، سەیارە دزراوەکانیان دەلحاز بە هەمان شێوە ئاوا دەکردن. ماوەیەکی زۆری خایاند و بۆ سونەتیش نەک دزیی شەوان، بگرە دزیی ڕۆژیش کە لە بەرسێرەی دیدەی عەرەب و عەجەمان و چەقی شەقامی بازاڕدا بە زەبری لوولەی چەکەوە دەفڕێندرا و نەدەزاندرا کێنە؟!.

ئیتر ترس و شڵەژان و ئاژاوە و کەموکووڕیی گوزەرانی ڕۆژانەی خەڵکەکە لە هەموو ڕوویێکەوە، بە جارێک دابەزی و دەستی ئومێد لە قوونکی خراری ژیانی دوارۆژ تەواو بەربوو.

ڕۆژ بە ڕۆژیش نورینگی یەکتریان تۆپباران دەکرد.

***

ڕۆژێک بەسەر ماڵی سوارەیان دادا و لە کاتی چوونەژوورەوەیان، بۆ ئەوەی دەنگیان لێوە نێت، هەموویان بە زەبری چەکەوە لە ژووری نانـدینیان پەستان و ئەوجا هەڕەشەشیان کرد نقەیان لەبەروەبێت هەموویان دەکوژن. دەرگاکانیشیان لەسەریان خشت کلیلدان.

خێزانەکە لە ترسی گیانیان قروقەپیان بەسەردا زاڵ بوو.

منداڵێکیان لە ژوورێکی لایەکی تری خانووەکە دەنێو لانک دەستی بە گریان کرد.

دراوسێکەیان دیوار بە دیوار ناو عەلی، هەر زوو حسیا دنیا چ باسە! خێرا لەگەڵ سامانی کوڕییەوە لە کولانکەی ستارەی بانەوە لە حەوشەی سوارەیان ڕووانی و دزەکانیان یەکە یەکەیان زەریف، لە حەوشە دەدیتن. چەکداربوون و ئامەشۆی کەلوپەل گواستنەوەیان بوو بۆ دەرەوە.

لەبەر دەمامک نەیاندەناسین.

منداڵەکەش دەم لە دەم قیژەی پتر دەهات و لە دوورەوە دەبیسترا و ژیر نەدەبووەوە، یەکێکیان گوتی:

- ئەو منداڵە بیژییە ڕیسەکەمان لێ دەکاتەوە خوری.

ئەمەی گوت و بۆی چووە ژوورەوە و فیشەکێکی لە دوڕدەمی ئاگر دا.

لە حیددەتان کە گەڕاوە دەمامکەکەی لە ڕووی دەلا

کەوتبوو و هێندە کەلوپەلی ماڵەکەی لەسەر شان و بۆ دەرەوەی حەوشەی دەبردن.

- بابە ئەوە عەزە چاوگازی پیاوی سیروانی کاربەدەستی گودلەیە.

باوکە بە حەیرمانەوە گوتی:

- چۆن دەزانیت؟!.

- ڕۆژ نییە لە بازاڕدا بە چەکەوەی نەبینم.

جاری دووەم کە بۆ حەوشە گەڕاوە ئاماژەی بۆ کرد، کەچی ئەوسا دەمامکی خۆی دابووەوە.

ماوەیەک سەری قار و دەغەزی بادا و جا گوتی:

- کەواتە ئەو حیزودزەی ئەو ماوەیە بیلبتوون لەمەڕ سەری خۆیانە، بۆیە هەردەم پەردەپۆشە و بە درۆزنەکانیشیان باوەڕیان بە ئێمەی کەودەری و عەقڵ لە چۆکان هێناوە:

- دز حەددی نییە لەم شارەدا سەر هەڵ بدات.

- بابە ئەگەر بە فیتی خۆیان نەبێ، کێ حەددی هەیە بە نوێژی نیوەڕۆ و زەقەزەقی چاوان ئاوا بەسەر ماڵاندا بدەن؟!.

***

ڕاوەڕووتەکەی ئەو ڕۆژەیـــان لەســـەر زاری عەلـــی و کــوڕەکەیەوە لە شــار بــڵاو بــووەوە، ناخاســمە کوشــتنی منــداڵەکە. دوای وێکەوتنێکـــی زۆری گــودڵەوە بە هــۆی خەفیەکانییەوە غەنیمی خۆی ناسـی و ڕووی بە غەزەبەوە لە سیروان و شێروان و ئەو چەکدارانەی لەگەڵیان بوون کرد و گوتی:

- ئێــوە پێشــمەرگەی ڕاســتەقینە نیــنە و قوونتــان هەردەم بە دەرەوەیە، لە سایەی کۆشانە هەڵەکەتانەوە ڕیسـە کشـتەکەی چەند وەختانمان بە جارێک لێ بووەوە خوری.

هەردووکیان زۆر پێ داخدار بوون.

گودلە سەری غەزەبی بادا و بە هەڵچوونەوە گوتی:

- ئەو ئابڕووچوونەمان هەمووی لەمەڕ سەزی تۆیە چاوگاز.

ئەویش بۆ بەرگری لە کردەوەکانی خۆی گوتی:

- مــن دەمــامکی خــۆم وەک هاوڕێکــانم دابــوو، چۆنیــان ناسیومن؟!.

- گەوجە.. بە ڕۆژ بــووە و بە ڕووشـــت نەناســرێی ئەدی شمەکەکانی بەرت!.

ڕەنگپەڕینەکەی تۆزێک هێور بووەوە و گوتی:

- باشە ئەوا بەسەر ماڵانتـان دادا، بەڵام کـێ پێـی گـوتن بە

نـویێژی نیـوەڕۆ منـداڵی نێـو لانـک لە دوڕ ژووری خۆیـان بکوژن؟!. نەتاندەزانی ڕۆژێک دادێت ئاوا ئاشکرا دەبێـت و ئابڕووی دنیا و قیامەتمان دەچێت!.

عەزە چاوگاز لە تاوان پشکی دەهێنا و هـیچ بەڵگەشـی بە دەستەوە نەما، لەگەڵ قیتبوونەوەیدا گوتی:

- ئەگەر منـداڵەکەمان نەکوشـتبووایە، دراوسـێکان بە هـۆی گریانەکەیەوە بەسەرمان وەردەبوون.

ڕووی زیاتر پڕ هەڵما و بە دەنگی حێلترەوە گوتی:

- مەرجە هەر هەنووکە بچم خۆی و کوڕەکەی لە خـوێنی خۆیان بگەوزێنم.

بە قـــارەوە لە زەوی ڕامـــا و جـــا ســـەری تـــووڕەیی بەرزکردەوە و گوتی:

- ئەوجـا هەر ئەوە مـابوو کەتنێکـی تـری ئاوامـان تـووش بکەیتەوە.

- کەتنی چی..؟!.

- بێ مێشک غەنیمەکەمان ناکۆکی و کێشەی لەگەڵ هـیچ کەس نیـیە و کوشـتنەکەش لەم سـاتەدا بەسـەر ئـێمە سـاخ دەبێتەوە و بە بارەبار دەڵێن:

- کەسێک منداڵی ناو بێشـکە، بە نـویێژی نیـوەڕۆ و لە دوڕ ژووری خۆیان بکوژێت، لە هیچ تـاوانێکی بـێ ئەخلاقـی و

بەدڕەوشتی ناپەنگێتەوە.

- ئەدی هەر ئاوا لەو تاوانە بێدەنگ بین.

- نەخێر. ئەگەر نەیکوژین من لە باوکی خۆم نیمە، بەڵام لەم دەمودەستە نا. دوای مانگێک، دووان ڕەتبوونی ئەو بابەتە لە سەر زاران، من پێتان دەڵێم:

- چۆنی بتۆپێنن!.

پاش چل ڕۆژ زیاتر وێکەوت کە غەنیمەکەی...... قەمەرەیەکی بیجۆی سپیی ژمارە ((---)) هەیە و هەموو بەیانیان لەگەڵ ڕۆژ و بان کەوتندا بە خۆی و کوڕەکەیەوە دەچنە دووکان و حەددوسەددی نوێژی مەغریب دەگەڕێنەوە.

چاوگازی تێگەیاند و گوتی:

- ڕۆژانە سایەدی بکە هەتا بۆت باش هەڵ دەکەوێت، بە دەعمی سەیارە لەناوی بەرە، نەک گوللە. ئەوسا کەس شکی بۆ ئێمە ناچێت.

- بە ڕای من لە کاتی ئێوارە بێت شیاوترە.

چاوگاز پیکاب تویتەیەکی مکوومی هەبوو، ئاسنێکی تەرحی شێلمان لەپێشەوەی لەحیم کرد و ڕەقەمی پشتەوەشی لابرد و لە وەختێکدا بوو ئاسمان دەیپرۆشاند، دنیاش

شرکەی ئێوارە بوو، لەسەر چەقی شەقامی سی مەتری و لە نزیک هۆڵی گەل، بە هەموو هێزییەوە لە قەمەرەکەی دا و سەراوژێری کرد. کەچی بۆ چرکەیەک نەوەستا هەتا گەیشتەوە لای گودلە. هەرکە بۆی دەورکردەوە زۆر کەیفداربوو و گوتی:

- ئەگەر باشت لێدابێت ڕووی خۆت سپی کردووەتەوە.

- لەسەر سەتی زیاتر بووم.

- تاکو کەس نەزانێت، پیکابەکەت بۆ ئەودیو بنێرە و من یەکێکی باشترت بۆ دەکڕم.

ڕۆژی دوایی وێکەوتن عەلی گیانی لەدەست داوە و کوڕەکەشی پێیەکی وا هوردوهەڕا بووە، کەڵکی یەکترگرتنەوەی نەماوە.

گودلە بە گوراح خۆشییەوە ئەملاوئەولای چاوگازی ماچ کرد و گوتی: ئەوجا کەڵەکەی ئۆخەم کەوتە عەردی.

***

ڕیشــە هەرکە واریقــاتی مــاڵی ســوارەی بەرگــوێ کەوت، شەوێک زانا و زەردەشت و چەند خـوبزەیەکی جەسـوور و شەڕوشۆڕدیتەی وەگڵدان و پەڕینەوە و بەسەر ماڵی چەتۆیان دادا، گەڕان منـداڵی ســاوایان بەرچــاو نەکەوت، لە تـۆڵەدا بیانکوژن، مام ڕەسووڵی باوکی ((٧٥)) ساڵی ڕەتدابوو، زانـا لوولەی چەکی لە دوورپەدەمی ڕاگرت و گوتی:

- ئەمەش لە جیاتی منداڵە ساواکەی مام سوارەیە.

زرمەی لێوە هێنا.

هەر ئەو شـــەوە بە بـــارگەیەکی گەورەی شڕوشـــاتاری تاڵانیی ماڵەکە حۆتر حۆتر گەڕانەوە.

***

بەردەوامــی ئەو دزی و تــاڵان و ڕاوەڕووتــانەی شــەو و ڕۆژی گودلە هەر لە زێدەدا بوون و هەر هەنـد هەلێـک بـۆ ئەمانە بڕەخسابووایە بازدانیان بە تاوان دەقەبڵاند.

نەک باشــــواکانی، بگــــرە داگیرەشەکانیشـــیان لە زەواق نابوون.

بــــاری ئــــابووری و گــــوزەران و مـــامەڵەی بـــازاڕ و تێکەولێکەی ڕۆژانەی ئەوان بەرەو کزی دەچوو، برسێتی و نــــاگرووری ڕۆژ بە ڕۆژ تەشــــەنەیان دەکـــرد. ئەمــــانیش ئـالوگۆڕی بازرگـانی و بـابەتی تریـان لەگەڵ ئەوان نـیمچە وەستابوو.

لە دەروونـــی هەردوولا چەکەرەی کردبـــوو، گـــودلە ئەو تەرزە دەسەڵاتەی لە دەڤەرەکە نییە، بە تەنیا و نوێژی نیوەڕۆ مـل لەم کـارە قەڵپـانە بنێـت. هەمـوو لەمەڕ سـەری قەسـتی ڕەشنزۆیە.

کارەکە بـۆ هەردوولا بووبـووە شـەوە و شـەو و ڕۆژ قـار گینگلەی پێ دەدان.

ئەو چارەنەویست و دەغەزخواردنەی ئەمـان بـۆ نێـو چیـنە زەیندار و سیاسی و سوپا و چەکدارەکانی خۆیان تەشـەنەی کـرد و بـووە بنێشـتە شـینکەی سـەرزاران، بە چـاوی تەژی قینەوە لە سەر و سەکوتیان دەڕوانی.

- گودلە وای لێ هات زیان بە ئێمەی داگیرەش بگەیەنێت.

- چۆلەکە خۆی هەیە هەتا شۆرباشی ببێت.

- گەر ئێمە پەنامان نەدابووایە دەگەیشتە ئەو پلەیە.

- وا دیارە نەک ئەمەک لە ئاست ئێمە لا شک نابردرێت، بگرە وەفای بۆ میللەتەکەی خۆشی کەم و زۆر لە ناخیەوە بەدی ناکرێت.

- ڕاستە ئەگەر نا بەم تەرزە ڕاوەڕووت و تالانە هەڵنەدەستا.

ماوەیەکی زۆری نەبرد بە ڤینی سیاسییەکانیان چەند ئەفسەرێک بە سەرکردایەتی ((زەعیم ڕەشپا))وە شەوێکی بێ کارەبا و بەترێکی بەسەرچووبوو، هەڵیان کوتایە سەر دامودەزگای ڕەشزۆ، بە کون فەیەکونێک سەرتاپایان داگیرکرد.

هەرچەند گەڕان و سووڕان و بەسەر ماڵەکانیان دادا، ڕەشزۆ و خزمەتکارەکانی دەسگیر نەکران.

ئیتر دەسەڵاتی کارگێڕی و دەڤەری کوانی یەکەم کەفتە دەست زەعیمی گۆرینەوە.

***

هەردوولا گەورە و بچووک، نێر و مێ، جاش و باش، زەینـدار و عولعـولی زۆر پـێ خۆشـحاڵ بـوون و بە چەپڵەڕێزانەوە، بە خۆشی و شادی و سەرفرازی و هوتافەوە ڕژانە سەر شەقامە سەرەکییەکانی شار، دارت هەڵبدابووایە بە عەردی نەدەکەوت، پڕ بەزار هاواریان دەکرد:

بژی بژی سەرۆکمان
ڕزگارکەری نیشتمان
خوا بیپارێزێ بۆمان

سەرکردەمان ڕەشپایە
بۆ دوژمنان بەڵایە
شادی ئێمەی هیوایە

بژی ڕەشپای قارەمان
دەربازکەری باشوایان
ناسرەوێتن لە کۆشان

ئێمە تا لەژیاندا ماوین
لە خزمەتیا وەستاوین

زەعیم زەعیم لیلئەمام
دیموکراتییە و سەلام

دەهۆڵ و زوڕنا و شایی و هەڵپەڕکێ لە سەرتاپای شاردا هەفتەیەک زیاتر بەردەوام بوو.

* * *

بەیانیی ڕۆژی دوای شۆڕشەکە، عەباسە شێتی دەفەرەکە لەسەر چەقی شەقامی بازاڕدا بە چەپڵە و هەڵپەرین و دەنگی بەرزەوە، لەگەڵ پەنجە بردن بۆ دیدەکانی، ئەمانەی دووپات دەکردەوە:

- من بەو چاوانەی خۆم دیت: سەرۆک و خزمەتکارەکانی خۆیان کردبووە حورمە و بەلایەکدا تێیان تەقاند.

* * *

پاش سەرکەوتنی شۆڕشەکەی ڕەشپا و نەمانی گیروگرفت لە ئاستیدا لە دوای ڕیشە و دەستوپەیوەندییەکانی نارد و لەسەر ڕووبار پێشوازییەکی زۆر گەرموگوڕ کران و هەرچی کەلوپەلیان بوو لەسەر شانی خەڵکە بەپیروەچووەکان دەدیتران.

ڕەشپاش بە خۆی پێشوازی کردن و لە کاتی ئاوقابوونیدا گوتی:

- ئێمە تازە بووینە برای یەکجارەکی و شاڵڵا لەمەودوا کەموکووڕیمان بە هیچ شێوەیەک لە نێواندا سەرهەڵنادات.

جا مەدالیای ئاشتی بە دەستی خۆی لە مل هەڵواسی. ئەمە بووە هۆی خۆشی دەربڕینی دەستوپێوەند و لایەنگرانی ڕیشە و لە هەردوولا بووە شایی و هوتافلێدان بەناوی ڕیشەوە.

ڕۆژ ڕۆژی مام شێخ و جەماعەتەکەی بوو لەگەڵ هاوحیزبەکانی داکەسانیان نەبوو:

ڕیشەیە سەرکردەمان

نەبەردی هەردوو کێوان

قارەمان و کۆڵنەدەر

هەرکەوی تاجی سەرمان

لە کۆشانا، ناسرەوێ

پێشڕەوی خەباتی ژیان

بۆ پێشەوە پێشمان کەوە

جەرگسۆزی مەزڵوومان

تا تۆمان جڵەودار بێ

دڵنیا دەبین لە ژیانمان

***

گـــودلە و ئەنـــدامانی حیـــزبەکەی لە دوای گەڕانەوەی غەنیمەکانیـان ئاویـان بە کـون وەربـوو، تەرحـی لە جـێگەی خراپ گیرابن هەردەم سەرشۆڕ و چاومۆن و کز و مەلـوول نەیانـــدەزانی چـۆن شـــەو و ڕۆژ بەســـەر بەرن، نـــاحەقیش نەبـــوون، بـــۆ هەردوولا واژی بـــووەوە کە هەتـــا ڕۆژی پێکهاتنەکە جاشـێکی کەمـۆی هەوساردارى ڕەشـزۆ بـوونە. ئەمە ناچاری کردن و دوور لە خوایشتی حەزیانەوە هانـا بـۆ ڕیشـە بەرن و بە دەسـت لەسـەر سـینگی تەوازووەوە وەبەر گوێی هەڵ بدەن:

- بەینمـان بەیـنەڵلا ئێـوە لەسـەر حەقـن و ئـێمەش هەڵە و بەکرێگیراو.

***

زەرف و سورتک بەم کارەی ڕەشپاوە کێچیان کەوتە کەوڵ و هەراسانییان لێ هەڵگیرا، نەیاندەزانی شەو و ڕۆژ چۆن بەڕێ بکەن. زوو زوو کۆدەبوونەوە و سورتک هەڵیدایە و گوتی:

- قەت بیرم بۆ ئەوە نەدەچوو ڕەشزۆ ئاوا زوو ببەزێت.

زەرف لێی وەرەگرتەوە و گوتی:

- ڕاست دەکەی، بەڵام ئەمە کەرخی سوپایە و لە هیچ وڵاتێک بەرووەستی نایەت.

- لەگینە.

زەرف ماوەیەک سەری نارەزایی بادا و گوتی:

- ئەگەر ئەو کارەی ڕەشپا بە زووترین کات چارە نەکەین، ترسی ڕووخانی من و تۆشی بەدوادا دێت.

سورتک بیری هەرگیز بۆ ئەمە نەدەچوو.. هەر زوو گوتی:

- حا.. هـ ا .

- حا و مای ناوێت، هەر کە میللەتی ژلات و بار بە هەموو توێژەکانیانەوە ڕۆژانە بەرگوێیان بکەوێت میللەتی ڕەشوا، وا لەوپەڕی خۆشی و شادی و سەربەستییەوە دەگوزەرێنن، ئەوسا بە گوڕی مەراقەوە هەوڵ دەدەن تا

بگەنە ئاستی ئەوان و ئێمەش شار بەدەر بکەن.

باوەڕی تەواو هات و بە هەشتاوییەوە گوتی:

- خۆ وایە! ئەی چارە؟!.

دوای دامانێکی کەم زاری هەڵێناوە و گوتی:

- پێویستە لەسەرمان بە هەر شێوەیەک بێت وا بکەین گودلە و ڕیشە دووبارە بێنەوە کۆڕی مەیدانی جەنگەوە و ئەوسا ئەو بێهێز دەبێت و ڕەشزۆ دەتوانێت سەرهەڵداتەوە.

هەوەستی پێ هات و گوتی:

- ئەوجا ئەوانە دەسبەرداری ئەو نازونیعمەتەی بۆیان هەڵکەوتووە دەبن؟.

بە پێکەنینەوە گوتی:

- تۆ ئەوانە باش ناناسیت، هەر لە ئیجادەوە هەستی نیشتمانییان بۆ سونەتیش لا شک نابردرێت و دۆخینیان لە ئاست دراو هەردەم شلە، نەخەسەلە لە ئاست پارەیەکی زۆر تەرحی ماکەر دەلاوچن.

بەدەست بەرزکردنەوە بەرەو حەواوە گوتی:

- خوا بە دەمتدا بڕوانێت.

***

زۆری نەبـرد زەرف نـوێنەری خـۆی بـۆ لای ڕیشـە ڕەوان کرد.

لە ڕۆخ ڕووبارەکە زانـا و زەردەشـت هەر کە چاویـان بە ((دارا پەژمـــین)) کەوت، پیـــاوێکی بە ســـام و هەیـــبەت و هەندام ڕێک و جوان و چەند چەکداریش هاوشانینە حسیان شتێکی لەژێر سەردایە و گوتیان:

- فەرموو تۆزێک پشوو بدە.

ئەویش دوای ناونیشانهەڵدانی خۆی، هەردووکیـان دەسـت لەسەر سینگ سەری تەوازووی بۆ لارکردەوە.

- پێویســـت بە پشـــوودان نیـــیە، بمـــبەنە لای حەزرەتـــی ڕیشەوە.

ڕیشە پێشتر دەیناسی و لە دوورەوە بە پیریەوە چوو.

پـاش بەخێرهـاتنێکی گەرموگـوڕ و خزمەتێکـی یەکجـار زۆر، بە زارێکی تەژی بافرەوە گوتی:

- جەنابی زەرف عەرزی سەڵاوی هەبوو، فەرمووی:

- دەبێ بە زووترین کات دەست بداتەوە چەک.

بە دیقەتەوە لە دەموچاوی ڕووانی و گوتی:

- لە عتاد و پارە نایێڵین بە هیچ شێوەیەک کەموکووڕیت ببێت.

بگەنە ئاستی ئەوان و ئێمەش شار بەدەر بکەن.

باوەڕی تەواو هات و بە هەشتاوییەوە گوتی:

- خۆ وایە! ئەی چارە؟!.

دوای دامانێکی کەم زاری هەڵێناوە و گوتی:

- پێویستە لەسەرمان بە هەر شێوەیەک بێت وا بکەین گودلە و ڕیشە دووبارە بێنەوە کۆڕی مەیدانی جەنگەوە و ئەوسا ئەو بێهێز دەبێت و ڕەشزۆ دەتوانێت سەرهەڵداتەوە.

هەوەستی پێ هات و گوتی:

- ئەوجا ئەوانە دەسبەرداری ئەو نازونیعمەتەی بۆیان هەڵکەوتووە دەبن؟.

بە پێکەنینەوە گوتی:

- تۆ ئەوانە باش ناناسیت، هەر لە ئێجادەوە هەستی نیشتمانییان بۆ سونەتیش لا شک نابردرێت و دۆخینیان لە ئاست دراو هەردەم شلە، نەخەسەلە لە ئاست پارەیەکی زۆر تەرحی ماکەر دەلاوچن.

بەدەست بەرزکردنەوە بەرەو حەواوە گوتی:

- خوا بە دەمتدا بڕوانێت.

***

زۆری نەبـرد زەرف نـوێنەری خـۆی بـۆ لای ڕیشـە ڕەوان کرد.

لە ڕۆخ ڕووبارەکە زانـا و زەردەشـت هەر کە چاویـان بە ((دارا پەژمـــین)) کەوت، پیـــاوێکی بە ســـام و هەیـــبەت و هەندام ڕێک و جوان و چەند چەکداریش هاوشانینە حسیان شتێکی لەژێر سەردایە و گوتیان:

- فەرموو تۆزێک پشوو بدە.

ئەویش دوای ناونیشانهەڵدانی خۆی، هەردووکیـان دەسـت لەسەر سینگ سەری تەوازووی بۆ لارکردەوە.

- پێویســـت بە پشـــوودان نیـــیە، بمـــبەنە لای حەزرەتـــی ڕیشەوە.

ڕیشە پێشتر دەیناسی و لە دوورەوە بە پیریەوە چوو.

پـاش بەخێرهـاتنێکی گەرموگـوڕ و خزمەتێکـی یەکجـار زۆر، بە زارێکی تەژی بافرەوە گوتی:

- جەنابی زەرف عەرزی سەڵاوی هەبوو، فەرمووی:

- دەبێ بە زووترین کات دەست بداتەوە چەک.

بە دیقەتەوە لە دەموچاوی ڕووانی و گوتی:

- لە عتاد و پارە نایێڵین بە هیچ شێوەیەک کەموکووڕیت ببێت.

دەمێک لە فکران ڕاچوو، کەچی ئەو دەیزانی بارەبەری چییە و هەر زوو پێش زارپچڕانی بە گوڕاح خۆشییەوە گوتی:

- چەندت چەک پێویستە، ئێمە ئامادەین، پارەش بە لای کەمییەوە لە سەت ملیۆن پترە.

ئەو بەردە گەرمەی هەرگیز پێ نەکەوتبوو، بلەز و بێ بێندان، بەوپەڕی خۆشییەوە گوتی:

- بە گیان و ماڵ لە خزمەتدامە.

سەری بە لای گودلەشدا گرت و ئەویشی خستە ژێر باری حەزیەوە.

پێنج و دوو ڕۆژی نەبرد ڕیشە دژی پێکهاتن و ڕێزگرتنەکە فەرمانی بە ئەندامانی حیزبەکەی دا و دەستیان دایەوە چەک.

گودلەش بەدوایەوە چرتەی دایە.

ڕەشپا شەرمی بە خۆ بوو ناوی بە خراپە بهێنێت، بگرە لە وتارەکانیدا هەردەم دەیگوت:

- هێندە کەس دەریانخست لە کۆڕی ژیاندا سفرە و بێ ئەمەکن.

ئیتر شەڕەکە، بە ماوەیەکی کەم وای کرد ڕەشپا زۆر بێهێز بێت و شەوێکی نوتەک ڕەشزۆ بە خۆ و هێزێکی

زۆرەوە هەلیان کوتایە سەر بارەگاکەی و دەسگیریان کرد، ماوەیان نەدا لەفزی بگەڕێت.

بە قوربانی چەند گوللەیەک کرا.

***

عەباسە شێت بە چەپڵەلێدان و هەلەکەسەماوە هەر دەیگوت:

- ئەو جارە بە چاوی خۆم دیت، سەرۆک و خزمەتکارەکانی خۆیان کردبووەوە پیاو و گەڕانەوە.

***

ڕەشزۆ لەو هەڵلاوزەنایەدا بۆی والآ بـووەوە ئەو کارەسـاتە دزێـوانەی ئاوقـای بـوونە، هەمـوو لەمەڕ سـەری پـیلانەکەی خۆیانە کە گودلە و ڕیشەیان بۆ بەرژەوەنـدیی خۆیـان بەرپـا کرد. کەچـی ئەمڕۆ.. وا بـوونەتە کونـدەبۆی وڵات و هەتـا چاویان زندوو بێـت، خۆشـی لە دەڤەرەکە نابینـدرێت. بـۆیە بڕیاری دا گوورزێکی کوشندەی وایان لێ بدات عەرەب لە حوشـتری نەدابێـت و هەتـا هەتـایێ نەتـوانن جـارێکی تـر چەکدارانە سەر هەڵدەنەوە.

ڕەشـزۆ لەگەڵ شـەبەقی کـازیوەی بەیانییەکـدا هێزێکـی یەکجـار زۆر بە مـودەڕەعە و زیـل و جێبـی عەسـکەری و تەژی سـەرباز و جەنـدرمە و چەنـدین ئامـانەی ئەهلـی لە دواوەیان بـوون و هێرشـیان کـردە سەر شـار و دێهاتەکـانی کوانی یەکەمی دەوروبەری ڕووبارەکەوە.

هەرچی بێ چەک بـوو، نێـر و مـێ و گەورە و بچـووک پۆل پۆل بە هات و هـاوار و ڕۆڕۆوە بە زەبـری قۆنـداخە و سەرەسـمک و پارەسـوان بەرەو نـاو ئامـانە و زیلانیـان ڕادەپێچان.

خەڵکەکەش پرزەبڕاو بوون و نەترەیان لە ناخەوە ڕووخـاو لە حەیفـان هەر ئەوەنـدەیان لەدەسـت دەهـات لە هـۆڕژنی گریان بدەن، نەخەسەلە ژن و زارۆک.

- وەیڕۆ.. بابەڕۆ.

- وەیڕۆ.. براڕۆ.

- وەیڕۆ.. دایەڕۆ.

- وەیڕۆ.. لە خۆمان ماڵوێرانیَ ڕۆ.

- وەیڕۆ.. لە خۆمان قەلەندەریَ ڕۆ.

- وەیڕۆ.. لە خۆمان بێکەسیَ ڕۆ.

- وەیڕۆ.. لە خۆمان چارەڕەشیَ ڕۆ.

- وەیڕۆ.. لە خۆمان بێهێزیَ ڕۆ.

هۆڕژنی گریانەکان سات بە سات چڕتر دەبوو و بە دەنگی بەرزی گریانەوە:

- مردنێکی موحەقەقمان تووش بووە.

- ئەوە گوتنی ناوێت.

- بە کاوەخۆ و بێزەوەریش.

- خۆزگە هەرکوشتنەکەمان بێت و چ کارەساتێک پێش قەرەور نەبێت.

- ئەمەش بەرهەمی کەسانی زۆردار و گۆردە و خۆفرۆشانە.

لە دواییدا بووە پەرێزپاکژی و ڕەشبگیرێکی زۆر بە دیقەت و وردییەوە لەنێو ژووری ماڵان دەگەڕان و ئەوانەی خۆشیان حەشار دابوو دەربازنەبوون، مەگەر تاک و تەرای

کەسانی ملازدراوی نێو کونەفیراران.

پیاو و ژنە کامڵ و پیریان لە نێو ئامانانیان پەستان.

قارەمەندی لەنێو زیلی عەسکەرییەوە.

هەر کە، کەســـی بـــێچەک لە دەڤەرەکە نەمـــا ئەوجـــا چەکدارەکانیشیان جـاش و بـاش بەشـێوەیەکی زۆر دزێـوتر ڕاپێچان.

- ئێوە جاشی سـێ ڕەنگـن و لە هەر کـوانێکی ژێردەسـتی ئێمەدا ڕەنگێک دەنوێنن، بۆیە هەتا ئەمڕۆی حـازری پشـتتان بە زەوی نەکەوتووە، بەڵام ئەو ڕۆژەتـان ڕۆیشـت جـارێکی تر بتوانن نان دوولەت بکەن.

ئەمانەیان خستە نێو زیلی عەسکەرییەوە.

مام شێخ زۆر پـێ تێکچـوو و ئاگـای لە خـۆ بـڕا و دوای دەمێـــک بەخۆهـــاتنەوە لە ژێـــرەوە کورکـــایەوە و بـــۆرە ئومێدێکی بە پێشمەرگەکان مابوو، ئەویـش وا بە یەکجـاری سڕایەوە.

پـێش ئەوە حەرەکە بـکەن لە نکـاو دارا بە فیتـی زەرفەوە گەیشتە لای ڕەشزۆوە و گوتی:

- پێویستە چەکـدارەکان دەسـبەجێ و بـێ قەیـد و شـەرت بەرەڵلا.. بکەیت.

بە دەغەزەوە وەڵامی داوە و گوتی:

- چۆنیان بەر بدەم؟، سەری سەبەبان بەس ئەوانە نەو لەوپاتەشمان پاشتر بۆ هەڵناکەوێت کێرمیزیانم نەهێشتووە و بۆ جارێکی تر کەسیان نامێنێت تاکو بێنەوە مەیدانی چەکدارییەوە.

- پێت دەڵێم خۆت خەشیم هەڵمەیەخە، ئەمڕۆ ئێمە هەرچیمان لە ئاستیان پێ دەکرێت بە سایەی چاوساخیی ئەوانەوەیە.

به دوودڵییەوە هەستی بۆ ڕاگرت و گوتی:

- گریمان ئەوانە لەناو بچن شۆڕشی ڕاستەقینە دەلحاز لە دەڤەرەکە سەر هەڵ دەدات و ئەوسا دەتوانن بە سانایی گەورەترین گوورزتان لێدەن، ئەوجا نە بەرووەستیان دێن و نە بەشوێنیان دەحسێن، نە دەزانن کێنە؟!.

باوەڕی زۆر لەم ڕووەوە پێ بوو و بە قسەکەی هەڵوێستەکەی یەکسەر سست بووەوە و ماوەیەک کەوتە کێژەنی ڕامان و بیرکردنەوە، لە ئەنجامدا بۆی یەکلابووەوە و گوتی:

- ڕاست دەکات. ئەگەرنا چۆن دەمانتوانی بە کونفەیەکونێک ئەو هەموو چەکدارانە باڵبەست بکەین و دووکەڵیش لە چەکیانەوە نەیەت.

بە هەستێکی تەژی باوەڕ و سۆزەوە ملی سەلماندنی بە شەوقەوە لار کردەوە.

***

حیلەی ئەسپان و زەڕەی کەران و قوڕەی چێلان و حەپەی سەگان و قاڕە و باعەی پەزان و قیڕوهۆڕی پەلەوەران، شادەیان بە فەرمەسۆنانیش دەهێنا.

جاجم و لێفە و بەڕە و بالیف و لباد و دۆشەک و ڕایەخ و جەواڵ و خرار و تێڕ و تورر و ملاکدان لەسەر شانی سەربازان هەڵتەک هەڵتەکیان بوو.

خشەخش و تەقوهۆڕی کوچکوچەیی سەندووق و کەنتۆر و باول و جانتا و لانک و قەلویێران، لە دوورەوە دەبیستران.

لە کاتی خەناوکە و زنجیرە زێڕ لە گەردەنی کچ و شۆڕەژنان دەپچڕێندران و ئەنگوستیلە و ئەڵقەی پەنجان رادەماڵدران، زیڕوهۆڕ و هاتوهاواریان دەگەیشتنە کەشکەلانی حەواوە:

- وەی هاوارە لە خۆمان بێکەسێ..

- وەی هاوارە ناموسمان ڕۆ.

- وەیرۆ.. شەرفمان ڕۆ.

- وەی هاوارە لە خۆمان بێ هاوریێ ڕۆ.

- کوڕانی باشوایان، شێرانی میللەتەکەمان پێشمەرگە کۆڵنەدەرەکانی کوانی یەکەم، تکایە بە هاوارمان وەرن.

- کوڕینە تۆزێک غیرەتتان بزوێت و ناموسمان لەدەست

ئەو گورگە دەم بە خوێن و بێویژدانەوە داوێن نەبەڕایەمان ڕزگار بکەن.

- دەی لەو چاوەتانە. دەی بە قوربانی دەست و چەکتان بین. بەزەییتان پێمان بێتەوە.

کەم و زۆر لە هیچ لاوە تاسا نەکرا بە هاواریانەوە بچین.. ئەوجا لەبەرچاوی چەکدارانی گودلە و ڕیشەوە خانووەکانیشیان سەرتاپا تەقاندەوە. مزگەوت و موستەسەفیشی گرتەوە.

ئامانە و زیلەکانی تەژی کەسانی باشوای گیرۆدەی ئەنفال، بەرەو گۆڕەکانی ئەنفالەوە سڕەیان بەستا.

دووکەڵی خانووسووتانیش ئاسمانی دەڤەرەکەی داپۆشتبوو و دەتگوت هەورێکی سپیاتی چڕە.

بۆ دانیشتووانی هەرسێکوانان والا بووەوە کە خانوو لە دەڤەرەکە بە پاوە نەما و خەڵکەکەش گیرۆدەی زندەبەچاڵەوە.

پێش ئەوەی بگەنە جێگەی مەرام، هێندێک لە سەربازەکان بە فەرمانی ملازم ((عیدان عەواد)) ئەو پیاوە باشواتەی، پۆتەلاکیان لەگەڵ ئەوانی تر جیابوو، چەند هەزار کەس دەبوون خڕیان هاوێر کردن و لەنێو زیلی تریان پەستان، پێش و پاشیان مودەڕەعە و بەرەو بیابانێکی قەفرایان لێخوڕین.

یەک دووێکیان ڕوویان لە ملازمی تایەن کرد و گوتیان:

- لەبەرچی ئێمەتان جیاکردەوە؟!.

بە ڕووێکی دڕدۆنگەوە گوتی:

- لەبەر ئەوە ئێوە لە هەموو یاخیبووانی باشوایان تاوانبارترن، بۆیە بە شێوەیەکی واتان دەتۆپێنن هیچ کەس بە خەیاڵیش بۆی نەچوو بێت.

لەنێو کۆنە حەسارێکی چواردەورە سیم و سپێری سوپایان دابەزاندن.

بێ ئاو و زاد و سێبەر و پێخەف.

ئەوانەی بە تەمەن و جەستە لاواز و پووخەڵە بوون، بەرگەیان نەگرت و گیانیان بە چەند ڕۆژێکی کەم لەدەست دا، ئەوانی تر دوو سێ ڕۆژ دواتر.

ئەوەی ئەجەلی دەهات یەکسەر تەرمەکەیان دەهێنا دەرەوە و دووریی حەسارەکەیان فڕێ دەدا.

ئەو دوو سێ سەربازەی یەکەم تەرمیان تووڕ هەڵدا ڕوویان لە ملازمی گۆرین کرد و گوتیان:

- گەورەمان ڕێگەمان بدە بینێژن.

بە غەزەبەوە بەرپەرچی دانەوە و گوتی:

- ئەوانە یاخی و دز و جەردەی هەڵەت و کێوانن و هەردەم دژی دەستووری وڵات بوونە، بۆیە پێویستە لە

تۆڵەدا هەتا داڵاش و جانەوەر پێست و ئەو گۆشتەی ماویـانە دەخۆن، ئەوجا هێسکەکانیان دەنێژن.

***

ئێـواره دنیـا تاریـک داهـاتبوو، کـاروانه ئەنفـاله گەورەکه گەیشته قزگەی مەرام. بیابانێکی هەتا چاو هەتەری دەکـرد پـان و بەریـن. تاریکەسـات بـوو، کەچـی موەلیـدەیەکی گەورەی کارەبایی، لەگەڵ گەیشتنه دوو سێ ئامـانه و زیلـی ئەنفالکراوەکان پێکرا.

هێشتا خەڵکەکەیان دانەبەزانـدبوون گـۆڕە ئەنفالەکانیـان به هۆی ڕووناکیی گڵۆپان به باشی کەوته به سێرەی دیـدەیان و ئەوسا حسیان و دڵنیاش بوون زندەبەچاڵ دەکرێن. پیـاو و ژن و منداڵی ئەو هەزاره زیله لێکرا له هاتوهاوار و زرووکه و قیـژه و ڕۆڕۆیەکـی وایـان دا، دەگەیشـته کەشـکەڵانی حەواوه و کافری زەندیق و شەیتانی کـوێری لەعینـیش پـێ دادەتڵەکان و نەترەیان دەڕووخا. تەنیا جەندرمەکانی داگیـرە شـەوه نەبـن. به هەر گریـان و هاوارێـک، دەسـته بەزێـک دەکەوته سەر دەندەرۆکی ئۆخەیانەوە.

دەنگه زۆرەکەش بەیەکەوه هاواریان چەند سەده هێسـتر و دووری دەڤەرەکه و بەرزایی ئاسمانەوەی دەنگی دەداوە.

- ویـ. ی

- ویـ. ی.

- ویـ. ی.

- ڕۆڵه ڕۆ.

- بابە ڕۆ.

- دایە ڕۆ.

- برا ڕۆ.

- کاکە ڕۆ.

- هاوارە لە خۆمان ماڵ ویرانیِ ڕۆ.

- هاوارە لە خۆمان غەریبیِ ڕۆ.

- وەیڕۆ.. لە خۆمان قوڕ بەسەریِ ڕۆ.

- وەیڕۆ.. لە خۆمان قەلەندەریِ ڕۆ.

- وەیڕۆ لە خۆمان بێکەسیِ ڕۆ.

- وەیڕۆ لە خۆمان چارەڕەشیِ ڕۆ.

- وەیڕۆ.. لە خۆمان بێخاوەنیِ ڕۆ.

لەگەڵ دابەزینیان ئەوانەی هۆش و گوڕیان تەواو لەخۆ مابوو و بۆ ئەوەی لە قەسابخانە موحەقەقەیان دەرباز بن، هەر کۆمەڵێک ترسی مردن هانیدان بە لایەکدا تیَ بتەقێنێت.

کەچی سەرباز و جەندرمەکان پێشتر چەشنی پەرژین دەورەی شوێنەکەیان پتەوانە گرتبوو و لە هەرلاوە بە زەبری لوولەی تفەنگ و شاپ و ساڵدرمەوە بە هۆڕژنی گریانەوە دەیانگێڕانەوە.

هەردوو سەرباز و جەندرمە لە قۆڵی یەکێک ڕوو دەبوون و بە ڕاکێش ڕاکێش و هات و هاوارەوە بەرەو لێواری

قۆڕتەکانیان پەلکێش دەکرد و گوللەیەکیان لە تۆقی سەری دەدا و تووڕیان هەڵ دەدا نێو چاڵەوە.

هەرکە نێو مەتر دەما چاڵەکان پڕ بن، شۆفەر خۆڵی بەسەردا دەکردن و دەیپەستاوە.

زۆر منداڵ و مێردمنداڵ و ئافرەتان لە ترسی مردندا دڵیان بووراپەوە و بە چواردەستە هەڵیان دەگرتن و بێ ئەوەی گوللەی لێ خەسار بکەن، تێیان هەڵ دەدا نێو چاڵی ئەنفالەوە.

ئەم مەرگەساتە هەتا شەو بەسەرچوو و ڕۆژیش کەوتە بانەوە، بەردەوام بوو.

***

مام سەلال پیاوێکی باریکەڵە و بێدار و بارووڕیش چەرموو، ماڵی لە پەڕگەی شاری ((س–گ)) بوو، دوای نوێژی عەسر جەندرمەکانی داگیرەش هاشمی کوڕیان، بە شۆفەرەوە برد. ئەویش پێشتر بەرگوێی کەوتبوو، چاڵێکی یەکجار زۆر، بیست ((٢٠)) مەتر درێژ و قووڵی سێ و بەرینیش مەترێک چەند کیلۆمەتر دوور لە شارەکەیان بۆ ناشتنی تەرمی باشوایان ئامادە کراون.

ئەو شەوە لە حەژمەتان هەتا شەبەقی بەیان نەک هەر خەو تخوونی دیدەکانی نەکەوت، بگرە تەرحی دەوری فەقێیان لە پاڵ دیواری دەرەوەی حەوشەیان بە گورەوە سەفا و مەڕوای بوو، ناوە ناوە بە سەربادانی قارەوە ناو لەپەکانی قاییم بە یەک دادەدان و دەیپرتاند و:

-لا حەولە وەلا قووەتە ئیللا بیللا.. تووخوا ئێمە و ئەو مەرگەساتە قەباحەتەیان گوتووە؟!. ساڵ دوازدە مانگ کاسپی ماڵی خۆمان و هەتا ئەمڕۆی حازریش کڵاوی خۆمان گرتووە با نەیبات، چۆلەکەمان لە ئاو نەکردووە. ئێستاش وا لە ختوخۆڕا بە زەبری کوتەکەوە ئەو کارە کوفر و دزێوەمان ئاوقا کرا؟!.

بە سەربادانی دەغەزەوە:

-هەر خوا بۆمان چاک بکات گریمان لەمەودوا غەزەبمان

لەسەر ئەو کارە نامرۆیییەمان لێ نەگرێت، مەمنوون دەبین.

ئیتر هەردەم لەم هێن و منهێنەدا بەردەوام بوو، تەقوهـۆڕی کوشـتنەکەش هەر نەدەپساوە، قـاروخەفەت پتـر شـپرزەی دەکرد. هێشتا بەترێکی شەو مابوو لایتـی سـەیارەیەک لای دەڤەرەکە پەیـدا بـوو، لە دوورەوەڕا زانـی ئامـانەیە و بـۆ دەنگوباسێک لەسەر ئاو و ئاگر بوو، هەرکە نزیـک بـووەوە چووە بەرایی و ناسی کە خزمێکـی شارەکەیە و یەکسـەر گوتی:

-مەحموود هیزە چ کارەساتت بە دەمەوەیە؟!.

ماوەیەک بە ڕەنگپەڕین و چاوتەژی ڕۆنتکەوە سەری بـادا و گوتی:

-مامە ئەوەندە دزێو.. و ناهەموارە لە باس نـایەت، لەوسـاوە مچوڕکەی تـرس لە سـەرتاپای لەشـمەوە مێـروولە دەکـات. هەرچەند دەکەم لە تاقەتم هەرگیز دانییە بۆت بگێڕمەوە.

دەمێک متی بەسەردا سەپا و گوتی:

-دەتوانیـت کە هاشـم گەڕاوە بـۆت بگێـڕتەوە، ئەو لە مـن باشتر دەزانێت.

ویستی پیل پێوە نێت، کەچی ماوەی دوو خولەک سەری خەفەتانی بە سوکانەوە نا و بە نیمچە ئاوڕدانەوەیەک گوتی:

-بەس داوایەکم هەیە.

ئەویش لەوساتە حەرەجەدا بیری بۆ هیچ شتێک بڕی نەدەکرد و یەکسەر گوتی:

-فەرموون.

-پیاوێکی باشوا لەو ئەنفالە شوومە ئەجەلی نەهاتبوو، ئەگەر دوای بەیانی گەیشتە لات بە قەدەر توانات یارمەتی بدە. خێرت زۆر دەگاتێ.

بەبێ خۆگنخاندن گوتی:

-باشە بە چاوان. بەس ئەوەشم پێ نالێیت چۆن قوتار بووە؟!.

خۆشی دەویست بۆیە هەرچۆنێک بوو ملی بۆ داواکەی لارکردەوە و گوتی:

-ئەو پیاوە لە پێشەوە سوار بووبوو، لە ڕێگادا هیچ قسەی نەدەکرد و هەر دەگریا.

منیش پێم گوت:

-خاڵە بۆ لە زێدە هەمووان هەر تۆ دەگرییت؟!.

ئەویش نەیتوانی لە بارە سیاسییەکەی بدوێت بۆ ئەوەی دڵنیای بکات و گوتی:

-چۆن نەگریێم کوڕ و کچ و خێزان و بووک و کوڕەزا و خوشك و برا و برازام، هەرچی خزمم هەیە کەسمان نەماوە و ئەوجا ناشزانم چمان لێ دەکەن و پاشەڕۆژمان چییە؟!.

منیش هەرگیز نەمتوانی واریقاتەکەی بۆ دەور بکەمەوە.

هێشتا دانەبەزیبوو هەر کە چاوی بە گۆڕە ئەنفالەکان کەوت، ئەوسا لە دڵی سەقادرا زندەبەچاڵ دەکرێن و یەکسەر دڵی بووڕایەوە.

هەرکە خەڵکەکەی ناو سەیارەکەمیان دابەزاند، من چووم ئەویش بهێنمە دەرەوە، دیتم هێشتا بە خۆ نەهاتبووەوە، منیش بە خۆم نەوەستام دەمێک بۆی گریام.

زەلامێکی چوارشانە و گەورە و جوان بە هەزار نالی عەلییەوە هێنامەوە ناوەڕاستی سەیارەکە و درێژم کرد و چوومەوە لای مەرگەساتەکەوە و هەرچەندی غیرەتم دا بەر خۆم نەمتوانی چوارێگێک خۆم بگرم و هاتمەوە لای سەیارەکە، دیتم کابرا بە خۆ هاتووەتەوە، بەس چۆکی ورەی ڕووخابوو، نەیدەتوانی قیت بێتەوە. بۆ ئەوەی کەس نەیبینێت سەیارەکەم تۆزێک دوورخستەوە و هێندێ ئاوی ساردم بە دەموچاویدا پڕژاند و هێندێکیشی خواردەوە.

لە ناخەوە دوام:

-خوایە ئەوەی بۆ تۆ دەکەم هەتا لەگەڵ ئەو ڕافزی و زەندیق و بێ مرووەتانەم حسێب نەکەیت.

گەڕامەوە، زۆر نەمابوو بگەمەوە شار، ترسام ئەو پیاوەم لەگەڵدا بێت جەندرمەکانی داگیرەشی دەوروبەرمان بزانن، یەکسەر بە فەتارەتم دەبەن. بۆیە دامبەزاند و پێم گوت:

-هەتا شەوە ڕوو لە شار مەکە، ئەگەرنا دەتناسن. هەرکە دنیا ڕوون بووەوە ئەوجا وەرە.

ئەوەندە پارەم دایە پێ بگاتەوە دەڤەری خۆی.

-بە پارەکەش گریا و گوتی:

-پارەیەکی زۆرم لابوو لێیان سەندم.

هێشتا شەو مابوو مام حەمموودی باوکی مەحموودیش بۆ یارمەتیدانی باشواکە هاتە لای مام سەلال.

***

بە دوودڵـی و چاشمیشــی و کۆمەڵێـک قـار و خەفەت و کارەســاتی نــامۆ و ئومێــدبڕانی چەشــەی ژیــان و تیشــکی ڕووناکیی خەباتی ڕزگاری و سـەرفرازی نەتەوایەتیـدا، وای لێ کرد لە هۆڕژنی گریانێکی بە کوڵی نـزیکەی سـەعاتێک بدات.

هێندەی نەمابوو دڵی لە شروان ببورێتەوە.

- وەیڕۆ.. میللەتە پڕزە بڕاوەکەم ڕۆ...
- وەیڕۆ.. نەتەوە لێقەوماوەکەم ڕۆ...
- وەیڕۆ.. میللـەتە، تەماچووەکەم ڕۆ...
- وەیڕۆ.. نەتەوە ڕەنج بە خەسارەکەم ڕۆ...
- وەیڕۆ.. میللـەتە بێ ئومێدەکەم ڕۆ...
- وەیڕۆ.. لە خۆم بێکەسێ ڕۆ...
- وەیڕۆ.. لە خۆم دمۆرێ ڕۆ...
- وەیڕۆ.. لە خۆم چارەڕەشێ ڕۆ...
- وەیڕۆ.. ئاگردان کاولبووەکەم ڕۆ...

کەمێـک زەینـی لە خـۆ بـڕا. دووبـارە لە پـڕمەی گریـانی داوە، نەیدەزانی چی بکات و چۆن هەتا شـەبەقی بەیـان لەو چۆلەوانییە خۆی گرمۆڵە بدات.

بیری بۆ هیچ دەرگـایەکی ڕزگـاری هەتەری نەدەکـرد. لە

تاوان هەشت نۆ کەڕەت ڕابیتەی بەملا و بەولادا کرد و دەیویست مل لە لایەکدا بنێت، کەچی ئەمە سستی کردەوە:

- هەتا شەوە، تاکو نەناسرێیت تخوونی ئاوەدانی مەکەوە!.

دەستی ڕاستەی بە قوچاوییەوە توند لەگەڵ قلپێکی دەنگدارەوە، لە ناو لەپی چەپەیدا، هیچ شتێکی لە مێشکدا نەدەزرنگایەوە، لەسەر چینچکان هەڵتوتکا و بە پەنجەی دۆشاومژە لەسەر خۆڵە پۆکەکەی بەردەمی:

- ئەنفالی نەگریس و بنبڕی ڕچەڵەکم، پرزەبڕانی خەباتی نەتەوایەتی، نووسی.

بیری هەردەم بە کارەساتەکەوە پەیوەست بووە و قەلاقۆچکەی دەغەزانی پێ دەخواردەوە. نۆباتیش چەشنی سپیانی گێژ بە هەر چوار ئالیی خۆیدا لە شێوەی گێرە، ڕەوهانانی دەخولایەوە.

حەیف لەسەر گازەرەی پشت ڕای کشاند و لاتە عەردێکی گرت و چرچەی لە خۆ بڕی. گریانیش بەرۆکی بەرنەدەدا.

تەقەوهۆڕی تفەنگی بکوژی نەتەوەکەشی بە جارێک هەراسانی کردبوو، کینگڵەی پێ لێ دەدا.

هەڵبەزودابەزی هەناوی و زۆر قلپهاتنەوەی دەغەزان، نۆرەیان نەدەدا. ناوەناوەش گریان بەربینگی دەگرتەوە.

هەنۆب لە ڕۆڕۆی داوە و:

- نەفرەت لەخۆتان و چەکتان.

- نەفرەت لەو کەسانەش کە دروستیان کردووە.

دنیا کشومات، لەو ساتەدا هەستی باشی نەدەهات.

دوای هیلاک و شەکەتێکی زۆر، چاوە تەمابڕاوەکانی بە شـــــڵەژانەوە و دوور لە خوایشـــــتی حەزیەوە بڕیبـــــوونە کەشـکەلانی حەواوە و سـامالێکی زیـوین و ئەسـتێرەکان بە ڕووی دەبریقانەوە و خۆیان شەنگتر هەڵخستبوو، ماتیـان بـۆ ژماردنی یەکە یەکەیان لەباربوو.

بە هەردوو دەســت، تـاکو تەقەی بکوژەکـانی نەبیسـتێت، هەرتەقەیەک گوللـــەیەکی کـاریگەر بـوو ئاڕاســتەی دوڕ جمجمەی سەری دەکرا، گوێیەکانی قەپات کردن.

گـۆترە نیـیە سـەرتاپای بنەمـاڵەی بەربـاد بـن و تێکۆشـانی ڕزگاریی نەتەوایەتی چەندین ساڵەش فرتەوفاتی بگاتێ. ئەمە سات بە سـات دەیشـڵەژاند وڕتـری دەکـرد. پشووسـوارییش هەر هیچ.

تـاریکە شــەو بـوو، کەچــی ئەسـتێرەکان ڕوونـاکییەکی زۆریـــان بە دەوروبەری پەرش کردبـــوو، ســۆمای چەنـــد گەزێک هەتەری دەکرد.

ســارایەکی چۆڵوهــۆڵ، نە ئــاو نە درەخــت و شــینایی.

بەڕەواژیی دەڤەری خۆی تەنیا خۆل و ڕمری وردی زۆر. بۆنی خوێنی لێ دەهات، لەم ساتە سامناکە و تاق و تەنیایەدا، ئەمەی لە منداڵییەوەی بەرگوێ کەوتبوو بەیادا گوزەری کرد:

- دەعبا و دڕندەی زۆرە، نەخاسمە گەلە گورگ.

هەر زندەوەرێکیان بەر سێرەی چاو پێ بکەوێت.

- ئاژەڵ، دڕندە، بنیادەم دەلحاز تیکە بە تیکەی دەکەن.

لە شروی کارەساتەکە بە هەندی هەڵ نەگرت و ترس لەو دەمەدا بارگەی لە دەروونە تەنگەکەی تێکنابوو. لە گیانی خۆشی زۆر وەڕەسی وابوو، لە مل خۆشبوو یەزدان دەلحاز ئامانەتی خۆی لێ وەرگرتەوە.

- شاڵلا ڕەوەیەکم لێ قیت دەبنەوە و دەمکەنە خۆراکی خۆیان.

ماوەیەک خەفەت گینگڵەی پێ دا و:

- دوای نەمانی خاووخێزان و ڕچەڵەک و پێشمەرگەی جانفیدا و قزگەی ئومێدی دوارۆژ و زندەبەچاڵکردنی سەتان ڕۆڵەی بێتاوانی نەتەوە هەشبەسەر و پرزەبڕاوەکەشم، قارەمەندی ژیانی من چ سوودێکی لەمەولا دەبێت.

ئاواتی هەرەگەورەی لەو ساتەدا:

- ئەوە بوو بووایە بۆ من کۆزوشەش بوو، ئەو کات لە

کـۆڵ ئەو ژیـانە زەقنەبـووتە و تەژی مەینەتـی جەرگبڕ و تەمابڕانی کۆڕی ژیانیش هەر هیچ دەبوومەوە.

لەم کێشـــمەکێش و خنگەملانێـــیەدا دەیگوزەرانـــد و ڕوونـاکیی ژیـانی دواڕۆژی بە ئەنـدازەی فسـەگورگێک لە نـاخییەوە شـک نەدەبـردرا و بە هەر دە پەنجـان گلەیـی دەردەبڕی لەو ئەنفالە شوومە باشواقڕانە دەربازبووە.

لەگەڵ لابردنـی دەسـتەکانی و هەسـتڕاگرتنی لە تەقەی بکوژانی نەتەوەکەی هەراسانی کردەوە. لەپڕ خشپەیەکی لە نزیکییەوە بەرگوێ کەوت. نیازەکەی دەروونی دەلحاز تـۆرا و لەو ساتە بێهیوایەدا بیم شڵەژاندی و تۆقین شپرزەی کـرد و کارەسـاتەکەش لە نـاخییەوە تـۆرا و گیـانیش لە بەرایـی هەمـوو شـتێکە، یەکسـەر ئاوقـای ئەوینـی ژیـان بـووەوە و تەنگەتـاو قیتـی کـردەوە، تـاکو نەبێـتە بـابۆ لە یەک چـنگە پڕەیەکی مانی بە قەدەر توانا بکات.

دیدەکانی بلەز بۆ زانین و ئـاوخواردنەوەی دڵـیەوە وشـت و چاشمیشانە بە هەر چوار ئالیدا گێڕا و زەلامێکی دوو سێ مەتـــر دوور و هەنـــدام قـــولەمەیتەرانە و گورجوگـــۆڵ و دەمامکـدراو لەم سـارا قەفـرایەدا، بـێ گـرەی ئۆتۆمبێـل و چـــرپەی پێـــی بـــارەبەر و بنیادەمێـــک، وەک لە ئاســـمان دابەزیبێت، یاخۆ لە زەوی هەڵقوولابێت، لە نزیکییەوە داهۆڵ ئاسا قیت چەقیوە. ئەمە کاری کردە سەر هەسـت و نەتـرەی

به جارێـک داتڵەکانـد و زەنـدەقی دەلحـاز چووانـد و لە هەنـاوەوە تـرس گیـنگڵەی پـێ دەدا، بەرچـاوی غەمرانـد و هەناسەسواری وا لە دوورەوە مشەمشی دەبیسترا. هەتـا چەنـد سانییەیەک ڕەقـی وەسـتاند و کەسـەری ئەنفـال و ئاشـبەتاڵە گەورەکەی لەم سـاتەدا، لەوەتەی ئاوقـای بووبـوو لە یـاد سڕایەوە. دوای دوو سێ چرکە خۆشەویستیی ژیـان غیـرەت و گوڕی تۆزێک وەبەر نـاوە و کـابراش بـێ مـرتە و جـمە هەر لە شـوێنی خـۆی وەسـتا، بە جرەجـڕ و زارێکـی شـڕ و پچڕپچڕ هەر ئەوەتە دەبیسترا، گوتی:

- لە ڕاهی خوا پێم ناڵێیت تۆی سەڵتە زەلام لەو چۆڵەوانییە کـاکی بە کـاکییەدا، چییـت و چـۆن وا لەناکـاو پەیـدا بوویت؟!.

بە دەنگێکی زۆر نەرم و ناسراوی گوێی گوتی:

- پێویست بە گوتن ناکات، بە خۆت باش دەزانیت!.

بیم پتر دایگرت و چۆکەکانی لە دەسـەڵاتی دەرچـوون و تەق تەق بەیەکتر دەکەوتن و هەناوە کوتەش سەربار.

ناچار خۆشی و ترشی، بە تەتەڵەی لێوانەوە گوتی:

- بیـــرم لەمە زیـــاتر بـــۆ هیچـــی تـــر بـــڕ ناکـــات: ئەویش...............

گێڕاوە، پاشدان بەهەرحاڵ تانیدا بەر خۆی و گوتی:

- لەمەچێتر بیت.

کارەساتەکە تۆزێک لە ناخییەوە جوقەی دەرکردەوە و گوتی:

- بەتایێ ڕازی نەبووم، سێبەڕۆش سەربار.

بە زمانێکی شیرین و تەژی سۆزەوە گوتی:

- نەمگوت دەمناسیت؟!.

- ئاوی باوەڕ و دڵنیایی لەم ڕووەوە خواردەوە و لە ناخەوەی سەقا درا هاتنەکەی بۆ بە فەتارەتدانێتی، یاخۆ شێتی، ئەمەش دڵی هەموو کەسێکی جەسارەتدار بەرگەی ناگرێت.

ترس لە سکۆڵەی چەپی دڵییەوە شوێن کارەساتەکانی پڕ کردەوە و گیان لە جێگایەکی عاسییە، بە هەوەنتە نایەتە دەرەوە، گوتی:

- هەر تۆ مابوویت ئاوقام ببیت سوورەگوڵی باخان.

کەچی تانی زۆر لە خۆیدا و بە زارێکی نەرم و شیرینەوە گوتی:

- وادیارە جەنابت مێملی ڕاستەقینەی گیانی منیت.

بیم پشووی پێ دا و پاشدان گوتی:

- هەتا لەسەر ئەو بارە پڕ تەنگوچەڵەمە و دەردەسەری و ئەنفالی مردنبارین و غەوارەییەدا، کە هەرگیز تووشی کەس نەبووە.......

دووباره کەمێک لێی گرتەوە، ملی ناچاری پێ خواستی حەزییەوە دانواند و گوتی:

- جەنابت بۆ دەستوەشاندن ئاوێزانی من دەبێت.

سەری نارەزایی، بێ نقە نزیکەی دە ((١٠)) دەقیقە لێ بادا و ئەوی بە جارێک داتڵەکاند، نەیدەزانی هۆیەکەی چییە، گوتی:

- مەگەر بۆ گاڵتەپێکردن بێت.

ئەمە تۆزێک بیمەکەی ڕەواندەوە، ویستی بە دەنگێکی برێک قاییمەوە بە ڕوویدا هەڵشاخێت، کەچی ئەو بە تەشەرەوە باگۆی داوەوە گوتی:

- لە دنیادا هەرگیز نەبووە و ناشبێت بنیادەمی جناوی شێت ببێت.

هەرکە لێی حاڵیبوو، دڕدۆنگی دایگرت و ترسەکەشی دەهات هێور ببێتەوە، دەسەڵاتیشی لەمە پتر نەبوو، بە جەسارەتەوە زاری پچڕاند و گوتی:

- بۆ من شێتم؟!.

بلەز سەری گرژی لەراندەوە و گوتی:

- سەت خۆزگە بە شێتی کات!.

دڵگیری ترسەکەی وەلانا و گریمان لە سونعی خۆی بووایە، ڕەنگە لەسەر ئەو گفتەیەی بەوپەڕی دەغەزەوە

بەرەنگاری بووایە و تێروپڕی بگوتبووایە، کەچی تاسای کەم و زۆر نەکرد، زمانی دژی بە ئاستەمیش وەگەڕ بێخێت، ناچار بۆ بەرگری لە کەسی خۆی بە هێدییەوە گوتی:

- دەبێ بەڵگەی سەلماندنی چەسپاوت لە باخەڵدا بێت، ئەگەر نا.........

نەیوێرا تەواوی بکات.

بۆ متمانەی دڵی بە دەنگێکی تۆزێک حێلەوە گوتی:

- شێت هەیە دەزانێت خۆی شێتە. ئەو تەرزە کەسەش هیچ حسێبێکی بۆ ناکرێت، کەچی شێت هەیە چەشنی جەنابت خۆت زۆر بە زانا و ئاقڵ و بیرکراوە دەخەملێنێت و خەمخۆری میللەتە مەزلووم و مافخوراو و خاک داگیرکراوەکەی خۆتی، کەچی لە ڕاستیدا شێتێکی بە دایک و باوکیت و فڕت بەسەر ئەوانەی گوتران، کەم و زۆر نییە.

لە دەروونەوە، بە درۆی دوو زەردێنەی شوبهاند و گوتی:

- ئەدی قوربان خەباتی سیاسی ئەوەندە ساڵەم چ لێ بکەم؟!.

دڵی تەواو لە ئاستیدا سارد بووەوە، کەچی لە ترسان لەمەی زیاتر توانای نەبوو هەڵی ڕێژێت:

- ئەمەی گوتت گۆترە نییە و بەڵگەی چەسپاوی گەرەکە.

بە هێدییەوە گوتی:

- من بە عەمری خۆم بوختانکەر نەبوومە و ناشبم، مانگ لە ئاسمانە و حەوجە بە بەڵگە ناکات هۆباب.

لای وابوو کارە مەکرووقەکەی گۆڕین هەر ڕووی نەداوە، زاری جەسارەتی کردەوە و گوتی:

- مەرجە باوەڕم پێ بهێنیت.

بە بزەیەکەوە گوتی:

- ئەمە سانایە و بەڵگەی بەهێزت لەم ڕووەوە لێ زیت دەکەمەوە.

بە مەترسی شێتبوونی بە دەستییەوە تەواو پەڕی و کارە نەگریسەکەشی لەم ساتەدا ئاوێزانی نەبووەوە و قوڵاخانە هەستی ڕاگرت.

بۆ ئەوەی لە دڵیدا تەواو سەقامگیر ببێت و ئەو بیروبۆچوونە دەڵەسە و کۆشان و دەربەدەرییەی ختوخۆڕایانەی چەند ساڵەیان بە ڕەوا و خوایشتەوە لە ناخی جمجمەیان ئاخنیبوو، بە هەوەنتە شلۆق نابێت و هەڵیدایە و گوتی:

- یەکەم من لە ئەجندە کافرەکانم.

بە مەترسی گۆڕین هۆی داوە و هورووژمی بۆ هێنا و گوتی:

- نەمگوت ئەجندەیە!.

بە سەربادانی ترسەوە لە دڵەوە منگاندی و:

- یەغیارە قۆڕەکەی من لەمەش دمۆرە و جنۆکەی کافرم بەرەنگار دەبێتەوە، نەک موسوڵمان!. ئەمەش کارەساتی دووەمە و ئاوقام بووە.

کەچی دەسەڵاتی نقە و جووڵەی بە هیچ شێوەیەک نەبوو.

- ئەجندە موسوڵمانەکان هەرگیز نایانەوێت بەرپەرچی موسوڵمانە ستەمکارەکان لە پێناو حەز و خواستی موسوڵمانە زۆرلێکراوەکانی تەرزی ئێوە بدەنەوە. کەچی من هەردەم لایەنگیری چینی چەوساوە و مسکێنم و بە مردنی خۆم دێمە بەرێ نەک بە ڕەتانەوەی بنیادەمی بێدەسەڵات.

بەمە بڕێک کەیفساز بوو و بە بافرەکەوە گوتی:

- خوا بە دەمتدا بڕوانێت و شاڵڵا ئەو هەنگاوە پیرۆزەی دەنێیت و تۆڵەمان دەکەیتەوە.

لەو ساتەدا کارەساتەکە ناخەوەی هەژاند و لە دڵەوەش:

- تۆڵە دوای ترێ خەپشەی برێ.

پاش دیقەتدانێکی زۆر، لە ناخەوە منگاندی:

- ئـ. هـ جندۆکەی کافر و ئەو کارە کوجا مەرحابا.

هەر زوو:

- نەخێر من بۆ ئەوە نەهاتوومە دەستی خۆم بە خوێنی

ئێــوەی بنیــادەمە خــوێنرێژ و هەڵــپەدار و گێرەشــێوێن و ئاژاوەگێڕ پیس بکەم، یاخۆ ئازاردان.

بەمە هــۆپێکی لە خــۆی زانــی و لە دڵەوە منگانــدی و گوتی:

- ئەدی جەنــاب بەوشــەوە درەنــگە و لەو چــۆڵەوانییەدا هاربوویت لێرە گیرسایتەوە!.

هەر زوو:

- بگرە مەرامم ڕێگای ڕاستەقینەی دەربازبوونی یەکجاریتان لەژێر عەبای چەواشە تێکۆشانی چەند ساڵەتان کە نەتان هێشت میللەتە لێقەوماوەکەتان ڕۆژێک بۆ سونەتیش تام و ئۆخەی ژیان بچێژێت. کەچی داگییەکانی هەر سێکوان لە سایەی نەزانــین و ڕەنــج بە خەســاری و خەبــاتی نــاڕەوای ئێوەدا، سایەوەی بیست و چوار سەعاتەی بەر سێبەرن بۆتان واژی بکەمەوە، هەتا نەوەی داهاتووتان و ئەوانەی ماون لە ژیانــدا ســوودی لــێ وەرگــرن. نەک وەک ئەمــڕۆی ئێــوە هەردەم لەنێــو قووڕەشــینی نەزانیــنەوە، پەیــڕەوی گێــرەی ئۆمەرەخێــل بــکەن و بە خەبــاتی ڕاســتەقینەی نەتەوایەتیشــی بخەملێنن.

دیسان لە ژێرەوە دوا و:

- وادیارە شتێک وەک شارەزایەک شک دەبات.

دوای دەمێک وەستان باگۆی داوە و:

- ڕاســت ناکـات کەی ئـێمەی پێشــمەرگەی ڕاســتەقینەی مــیللەت لە هەوڵ و کۆششــمان گێــرەی ئۆمەرەخێلمـــان کردووە.

ناچار بە نابەدڵییەوە گوتی:

- ئەوجـا ئەوەی جەنابــت دەفەرموویــت چــۆن مەیســەر دەبێت؟!.

- گریمـان بە هەمـوو توانـای گیـانی و مـاڵییەوە جـددی و موشتاقانە، نەسڵەمێنەوە و پشووتان بۆ سونەتیش نەدا، لە سەتا سەت ئەو گیروگرفت و شەڕوشۆڕانەی چەندین ساڵەتان بـۆ هەتاهەتــایە دەســڕێنەوە و ئــۆخەی ســانەوە و شــادی بە یەکجـاری دەخـۆنەوە. ئەگەرنــا ڕۆژی جەژنە و خۆشــیتان ئەمڕۆ دەبێت.

هەرکە لە مەرامــی حــاڵیبوو، ویســتی زاری لەم بــارەیەوە بپچڕێنێت، کەچی ئەو هەر زوو هۆیداوە و گوتی:

- بەس بە مەرجێک.

بیری هەرگیز بۆ هیچ شتێک نەدەچوو، کە تا ئەو کاتەش دڵــی لە دەراوێکــی تــری ئــاوی دەخــواردەوە، لە نــاخەوە مرتاندی و گوتی:

- بەڵکی بۆ بەرژەوەندیی میللەتەکەمی بێت!. ئەوا ژیانی من و تێکۆشـانی چەنـد سـاڵەمان ئاووئـاو چـوون، بەس بـۆ ئەو قوڕبەسەرانەی ماون.

بۆیە هەر زوو بێ خۆگنخاندن گوتی:

- هەر تۆ و مەرج، بە چاوان.

پێ کەیفدار بوو و گوتی:

- لەمەودوا چیت لێ دەپرسم نابێ لەو بابەتانەی دەیانزانی، یاخۆ لە ناختەوە چەکەرەیان کردووە، بە ئەندازەی مرتەیەک درۆم لەگەڵ بکەیت. دەنا ئەوسا منیش خۆم ئازار نادەم و دەچمەوە ڕیزی ئەجندە موسوڵمانەکانەوە!

کارەساتەکەش بە هۆی گفتوگۆیەکەوە لە دەروونەوەی کەمێک کز بووبووەوە.

کە تەواو لە تەماکەی گەیشت، ترسی شێتبوونی وەلانا و:

- ئێ .. هـ بەڵکی سوودێک بۆ ئەو باشوایانەی لە ژیاندا ماون بگەیەنێت.

بەوپەڕی کەیفسازییەوە گوتی:

- بڕیار بێت لە ڕاستی بەملاوە زیاترت لە من بەرگوێ نەکەوێت.

- منیش لەو هاتنەمدا چیترم گەرەک نییە.

کە دڵنیابوو لەو ئەجندانەی باس کران نییە و بگرە سوود بە زارییەوەیە، هەر وەک یەکێکی خۆیی بێت و دەردە ئەنفالەکەش هورووژمی هێناوە، کەچی لە ناخەوەی چەپاڵەی دا و مەراقی ناسینی دەنگەکەش دایگرت و ماوەی

وەستانی نەما و گوتی:

- بەس......

نەیویست تەواوی بکات و ئەویش گوتی:

- بەس چی؟!.

لەبەر بەڵێنەکەی پێیدا بوو و ڕاستییەکەشی مەبەست بوو بزانێت گوتی:

- من دەنگی جەنابتم لەگوێ غەریب نییە و کەچی بیرم بۆ ناسینی خاوەنەکەی هەرگیز بڕ ناکات.

یەکسەر هەڵیدایە و گوتی:

- ڕاست دەکەیت من بە ئەنقەست دەنگی خۆم تەرزی دەنگی دۆستێکی نزیکت هەڵ خستووە، تاکو بە هیچ شێوەیەک لێم نەسرکییەوە و چی لاتە خرپ ڕاستیانەم بۆ هەڵڕێژیت.

بەمە گوراح خۆشیی دایگرت کە دوورەزیانە و گوتی:

- فەرموو:

ئەویش بە شەوقەوە گوتی:

- یەکەم: لە کاتی ڕاکشانتدا لەوسارایە بیروهۆشت بە چییەوە بەندبوو؟!.

بەمە باوەڕی تەواو هات جنۆکەیە و شتی نهێنیی نێو دڵی مرۆڤی لا شاراوە نییە و بە بافرەیەکی دوورەدڵە مەلەرزەوە گوتی:

- لەبەر ئەوە لە ژیاندا زگورتی و ئومێدبڕاو مامەوە زۆر لە گیانی خۆم وەڕس و بێزار بووبووم و پێشتریش وام بیستبوو: ئەو دەڤەرە ڕەوەگـــــورگی زۆر هەیە و تووشـــــی هەر گیانلەبەرێـک بـبن هەتـا بنیـادەمیش تیکەبەتـیکەی دەکەن. منـیش هیـوام لەو سـاتەدا ئەوەبـوو ڕەوەیەکـم ئاوقـابن و لە کـۆڵ ئەو ژیـانە عەجەمەرگیـیەی حـاڵی حـازرییەی تێـدامە دەکەنەوە.

باوەڕی تەواو هات و گوتی:

- ڕاست دەکەیـت، ئەدی لەبەرچی هەرکە خشپەی منـت بیست سرکانە قیت بوویتەوە؟!.

بۆی واژی بووەوە لە شتی نهێنی ئاگادارە، ئەگەر نا چـۆن جۆری ڕاستبوونەوەکەم دەزانێت.

بە ڕووێکی عوبابەوە گوتی:

- دڵم خەبەری دا گەلەگورگ بن و ترسی مردن شـاڵاوی بۆ هێنام و هۆشمی داگیرکرد، جـگە لە خۆشەویسـتی گیـان عەشتەبای لە دەروونمەوە نەهێشت و چوست قیتی کـردمەوە و هەتـا نەخـوراوم بە ڕنۆکـانیش بێـت چنگەپڕەیەکـی مـان بکەم.

بە دەنگێکی کەمێک حێلەوە گوتی:

- بۆم تەواو سپی بووەوە کە جەنابت بۆ سـونەتیش خـاوەن ڕا و بۆچوونی خۆت نیت و بگرە دوودڵ و ڕاڕایت.

ئەمەی نەسەلماند و لە دڵەوە پڕتاندی و گوتی:

- کەی مـن لە کـۆڕی ژیانمـدا دوودڵ و ڕاڕامە، ئەگەرنـا چۆن دەکەوتمە نێو ئەوفاقە نەگریسەوە.

بە ئەوەندەش نەوەستا و:

- وێڕای ئەوەش لە قەلەزراویدا هاوتات دەگمەنە.

بەمە ڕووی یەکسـەر دڕدۆنـگ هەڵـگەڕا و لە ملـی زۆرگران بوو و گوتی:

- من چەند ساڵە دەستم لەگەڵ پێشمەرگان تێکەڵ کردبـوو و خۆم و ماڵ و منداڵ و خزمیشم لەسەر دانان، هەنـووکەش کاکی لەمەچێتر بە ترسنۆکم دەقەبڵێنێت.

هەر هێندەی دەسەڵات بوو بە دەغەزاوییەوە گوتی:

- باشـە جەنابـت چـۆن دەزانیـت مـن ئەو دوو خەسـڵەتە دزێوەم هەنە؟!.

- ئاشکرایە و کەس زۆری لێ نەکردبوویت و بە کەیف و ماشای خۆتەوە بڕیـارت دابـوو. بـۆیە نەتـدابووایە، یـاخۆ کە دات هەرگیز نابووایە پاشگەز ببیتەوە.

ئەمەی سەلماند و بەڵام:

- خـوا دەزانێـت لەبەر پڕزەبـڕاوی و بێچـارەیی و تـاریکی دوارۆژی ژیانم بوو.و بەس..

ئەویش لەسەر گفتەکەی بەردەوام بوو و گوتی:

- گریمـــان جەســـووریش بووایـــت، هەر کە گوێـــت لە خشـــپەیەک بـــوو یەکســـەر هەر بە درێژبوونەوەتـــدا پـــڕ بە دەنگت دەتنەڕاند و دەتگوت:

- من لێرەمە و وەرن بمخۆن. من لێرەمە و وەرن بمخۆن.

ئەمەشی بە هەمووار خەملاند و حەرەجـی کەم و زۆر لـێ نەبوو و چەشنی ماری زەڕکردە خۆی بردەوە غەریفێ.

لەمەچێتـــر وچـــانی نەدا و ڕووی زاری بە لایەکـــی تـــر کردەوە و گوتی:

- پێم نالێیت ئێوەی خاکداگیرکراو و مەزلوومترین میللەتی دەڤەرەکە چەند ساڵە خەشیمانە لە گێژاوی کوشـتن و بـڕین و ئاژاوە و دووبەرەکی و ماڵوێرانی و زندەبەچاڵ و ئەنفال و فەرهـــود و ڕاونـــان و دەربەدەری و ئاشـــبەتاڵی و چەواشـــە شۆڕشەوە موشتاقانە خنگەملانێتانە؟!.

- پرمۆتکیش نۆبات ئەو قسە شەتەحاتانەی دەجوویەوە.

بە سەربادانی قین و خەفەتەوە گوتی:

- ئێرە لە کوێ و ئەو هەژارە قوڕبەسـەر و زنـدەبەچاڵکراوە لە کوێ؟!. بە چاوی خۆم دیت لە نێو ئامانەکەی ئێمەدا بوو و ڕاپێچیان کردا.

- مام شـێخ چـۆن لەو جموجـۆڵییەی چەکـدارانی چەواشـە شۆڕشی ئەمڕۆ دەگەیت؟.

بە غەزەب و چاوی لێڵ و وێڵەوە گوتی:

- شەکرت خوارد.

بە هەڵچوون و دەنگی قاییمترەوە گوتی:

- بڵێ شۆڕشی ڕاستەقینە.

دانیشتبوو، قیت بووەوە و جا گوتی:

- جارێکی تر هەرگیز لێت قەبووڵ ناکەم ئەو تەرحە پەتکانە لە ئاست شۆڕشە مەزنەکەمانەوە بەردەیتەوە.

لەم ڕووەوە باشی دەناسی چەند مووی بە لەشییەوەیە و کەڵکی دار تێوەردانی بە هیچ شێوەیەک نییە و بۆنی زیاتر دێت.

لاشی پەسند نەبوو لەگەڵی بکەوتە بەردەق بەردەقی بێ سوود و ئەنجام.

ئەمە وای لێ کرد خۆشی و ترشی پاشگەزبێتەوە و هەتا هەڵچوونە نارەواکەی بڕەوتەوە گوتی:

- مام شێخ من لەم بارەیەوە گریمان لە ئاست بیروبۆچوونی جەنابتەوە سەرچیخیش چووبم داوای چاوپۆشیت لێ دەکەم.

بە غەزبەوە گوتی:

- سەرچیخ چوون جووداوازە و تانەوتەشەرەی زەقی بێزەوەری حەرامانەش جوودا.

کافر بە خێرا خۆی ناچێتە دۆزەخەوە و لە دڵەوە دایەبەرێ

و گوتی:

- ئەلحوکمولیللا.

ئەوجا زاری بە ڕوویدا هەڵێنا و گوتی:

- دووبارە داوای لێبوردن دەکەم و نابێ بە هیچ شێوەیەک لە یەکێکی عولعولی وەک من کە نۆبات لە گفتوگۆدا، بە پێخواسی بەناو دەکەوم دڵگیر ببیت.

لەناخەوە زاری بە لایەکی تر وەچەرخاندەوە گوتی:

- بابزانین سەر سەدەی کاکی جنۆکە دەگاتە کێندەر:

بە ئەنقەست ڕووی گەش نواند و بە دەنگێکی قیچێک بەرزەوە گوتی:

- بە چی دەزانیت چەواشە شۆڕش بووە؟!.

لە دەروونەوەش:

- تڕحێو تەڕ دەزانیت!.

پرسیارەکەی بە هەموار حەملاند و گوتی:

- پێم ناڵێیت: شۆڕش لە پێناو چی بەرپا دەبێت؟.

ئەمەی لە مل سووک بوو و بێ خۆگنخاندنەوە گوتی:

- بێگومان دژی کەسانی داگیرکەرانی نیشتمان و ئەو ستەمکارانەی میللەت دەچەوسێننەوە و بەرهەمی نیشتمان دەدزن و وڵاتیش کاول و وێران سەرهەڵ دەدات.

بە هێدییەوە گوتی:

بەمە لە سـکۆڵەی چەپـی دڵیـیەوە قرمسـا لە هەمـوو دەراوێکی پەڕەکەی ناخییەوە ئاو دەخواتەوە. بۆیە ویستی وای دەخواست بە هیچ جۆرێک لە ئاستیدا لەکەدار نەبێت و هەر زوو:

- وێـڕای ئەوەش هەرگیز نەک لە دەستووری ژیانماندا نەبووە، بگرە بە خەیاڵیشماندا گوزەری نەکردبوو ڕۆژێک لە ڕۆژان پاشگەز ببینەوە و بڵێین:

- ئێمە هەڵە بووین.

گەشی ڕووی داگرت و گوتی:

- دەستخۆشـی لە ڕاسـتبێژییەکەت دەکەم، کە یەکەم مرۆڤیـت پێـت لە قەبـرغەی بەرژەوەنـدی خـۆت و هاوڕازەکانت بنێیت.

بە بافرەیەکەوە گوتی:

- غێر بەڵێنم پێ داوی.

بۆ ئەوەی هێندە شتی کەسنەزان تەبەڕابێت و گوتی:

- جلەودارانیش لە گوزەراندا هاوتای میللەتن.

ئەمەی هەرگیز بە دڵ نەبوو و گوتی:

- ئەوانە هەرچەند خراپ و بەد بن، نابێ لە شوێنی ئاوادا، خـوا پـایەبەرزیی پـێ بەخشـیوون پرتۆخیـان بە گـۆڕێ وەربکرێت: نەخەسەلە وا لە پێناوی ڕزگاری گەل و نیشتمان

گیانی خۆیان لەسەر دانا و پێویستە بە شانازییەوە پەیکەری مەزناتیان بۆ بنیات بنرێت، نەک هێرشکردنە سەریان.

کەچی بێ ویستی خواستییەوە، بە ملیدا هات، نەبادا لێی دەرببێت چۆنە وای بۆ هەڵڕژێت و گوتی:

- نەخێر جلەوداره‌کانمان ساڵ لە دوای ساڵ پتر دەهەنگڕێن و ئێمەش بەوپەڕی حەز و شەوقەوە پاڵپشتیانین.

هەر زوو:

- هەنگڕانەکانیان بە هۆی چییەوە بوو؟.

ئەمەشی بە مەیل نەبوو، کەچی بۆ ئەوەی لە ئاستیدا کەم و زۆر بە خیلاف دەرنەچێت گوتی:

- بە دزین و تاڵانی سەروەت و سامانی وڵات و کەلوپەلی میللەت و ڕووخانی ساختمانە گەورەکان و فرۆشتنی کاشی و کەرپووچ و بۆریی ئاو و وایەری هێڵی کارەبای دێهاتەکان و سەیارە فڕانیش سەربار.

هەرکەزانی ڕاستگۆیە، بە ئەوەندەش نەوەستا و گوتی:

- ئەو دێهاتانەی دوژمن بە هۆی چنگ قڕکردنەوەتان لە ئاستیدا کاولی کردبوون، چەندتتان ئاوەدان کردووەتەوە؟.

بەم پرسیارە لە دڵی چەسپا زۆر زانا و ئاگادار و دنیادیتەترە لە پیرمۆتک و دەیەوێت هەرچی پرتۆخی کاربەدەستانمان هەڵڕێژێت و گوتی:

- غێر لەمەچێترە و هەموو شتێکی نهێنی لەبەرچاوە.

بۆیە هەرگیز تاسای نەدەکرد پێ لەم بارەیەوە بە ئاستەمیش خوار دانێت، بە دڵساردییەوە گوتی:

- ئەو شوێنانەی فەرمووت بۆ سونەتیش ئاوڕیان لێ نەدراوەتەوە.

دوای باوەڕ بە قسەکانی هەڵیدایە و گوتی:

- سەت حەیف و مخابنە ناوی شۆڕشە و ئەوانەی پێشی هەستاون پێشمەرگەنە!

بە دەنگی بەرزترەوە گوتی:

- بگرە چەواشە شۆڕشێکی بە دایک و باوکە و جلەودارەکانیش جاشی داغمەداری ئاخری زەمانن. بۆیە بیکە گوارەی چوارگۆی بە کاریتەی گوێت، نیو سەدەی تریش بەم تەرزە تەقەڵای بە گوڕ و بێپسانەوە بدەن، خڕنووکێکتان بە نسیب نابێت.

بەم ڕاو و بۆچوونەوە بۆی بوو بە پیفۆکێکی سپیکراو، ئەجندەیەکی زۆر زانا و کارامەیە، بۆیە بە حەزەوە ئێـهـ بەلکی ڕێگایەکی گونجاوی دەربازبوون، دوای نەمانی خەبات و سەرکردەی شۆڕشەوە بۆ ئەو باشوا مەزلوومانەی لەژێر چەپۆکی داگیرکەکان ماون دەستنیشان بکات، بە ڕووێکی عوبابەوە گوتی:

- بۆم واڵا بووەوە کە جەنابت زۆر بیرتیژ و کارزانیت و وا دیاریشە چاک دەزانیت ئێمەی باشوای گیرۆدەی نەهامەتییەکی زۆر دزێوی بەردەوامی بیست و چوار سەعاتە بووینە و ئەو کارەساتانەی ئەمڕۆ و ساڵانی پێشتر بە زەبری کوتەک ئاویزانیان کردووین، تۆڵەیان ئاو و ئاو چوو.

بە ئاخهەلکێشانێکی داخدارەوە:

- کەچی بۆ ئەو قەوم و قیلەی دوای ئێمەمانان بە چاکە و هیممەتی جەنابتەوە ڕێگایەکی دەربازبوونیان بۆ دابین بکەیت.

خۆشی دەموچاوی داگرت و گوتی:

- ئەوەی من بۆم واژی بووەتەوە و حەوجە بە بەڵگە ناکات، ئێوە بە دوو ڕێگا دەتوانن بە سانایی و بێ ئەوەندە خوێنەی ساڵانەئاسا برژێت و تەقەلا بدەن، خۆتان لەژێر چەپۆکی کوشندەی داگیرکەر و زوڵم و زۆرداری ناوەخۆیی بۆ هەتاهەتایە ڕزگار بکەن و جارێکی تر بە خەونی شەوانیش تخونتان نەکەوتەوە.

بافرە پتر دایگرت و دەمی بێچووە پەڕاسێلکە کاتی دان لە دایکانە و بابانەکەی وەردەگرێت بەش بووەوە و پشووی لەگەڵ سوار بوو، لە ناخەوە دوا و گوتی:

- ئەگەرچی بۆ من عەشتەبای تێدا نەماوە، بەڵام هەستی مرۆڤایەتی هانم دەدات بۆ ئەو هەشبەسەرانەی ماون.

دەمێک خۆی بوارد و پاشان هەڵیدایە و گوتی:

- کەچی وەک نوێژ و ڕۆژی پێویستی سەرشانی گەورە و گچکەی دانیشتووانی کوانی یەکەمە:

- ئەوانەی نـــــاوبران لە ڕەگەوەیـــــان بناســـــن و بە کونفەیەکونێــک ولاتبەدەریــان بــکەن، ئەوســا بێگومــان بە چاوقوچینێک بە مەرامی ڕاستەقینەی خۆتان دەگەن. ئەگەرنا ڕەنجتان هەردەم دەبێتە پشیلۆکەی بەر بای هوڕەوە.

ئەمەشی بە پەسەند حسێب کرد و خۆی بێ جەمە و متەق بوارد.

ئەم بۆچوونەشی یەکەم جاربوو لە گوێیەکانی بـزرنگێنەوە و لە ســکۆلەکانی دڵیــیەوە چــووزەی چەســپیوی دەرکــرد: زانیــاری لە هەمــوو کەلـێن و کــون و قــوژبنێکی سیاســی و بیروبۆچوونی دەڤەرەکەی هەیە. ئەمەش سوخەتی ئەجندانە.

دووەم: هەریەکێکتان بووە جڵەودار و پێشڕەوی شۆڕشــتان بە خوایشــتی حەزیــیەوە، بــێ ئەرک و کــاری بەرژەوەنــدی شۆڕشەکە چەند ڕۆژێک تــۆتکەی ســانەوەی لە یەکێــک لە کوانەکــانی ژێــر چەپۆکی داگییەکــان گــرت و کەم و زۆر ئاوقای پەلاماردان و گرتن و کوشتن و هەراسانکردن نەبوو، ئەوە بێگومــان گــۆڕدەیەکی ملپــان و دۆڕاو و بــارەبەر و لەواشەکراوی داگییەکانە و کوفر و کەراتییەکی بە دایک و بــاوکە بە خــائینی نەخەملێــنن و پشــتی بە ئاســتەمیش پــێ ببەسترێت.

- وێـڕای ئەوەش هەر جموجۆڵییەکیشـی لە هەر بـارێکەوە ببێـت لە زرەر و زیـان و بە فەتارەتـدانی ئێـوە چیتـری لـێ ڕەچاو ناکرێت.

لە دوڕ مێشکی بۆ یەکەم جار لە ژیانیـدا چەقێلەی دەردا، کەچـــــی هەر زوو تەزووێکـــــی غەلغەلەیـــــی، بە نێـــــو ماسوولکەکانی جەستەیدا مێروولەی کرد و گوتی:

- بۆچوونەکانی وا بە بارەباڕ لە کونی کارک ڕاسـترن و بە ئەندازەی بالیفۆکەی خوایەک نارەوایی لێ شک نابردرێت، بەڵام........

دڵـــی بەروەســـتی نەدا زیـــاتر بچێـــتە دوێ، دوای چەنـــد سانییەیەک گەڕاوە زەینی و خورپەیەکی نامۆ هەڵوێستەکەی دەلحاز گۆڕی و گوتی:

- گریمان ڕاست بێت، دەبێ ئێمە لەمەودوا هەردەم......

دەمێک کەوتە گێژەنی دامانەوە و گوتی:

- نـا.. نـا.. ئەوانە لەبەرچـاوی خـۆم کەوتـنە بەر حەمـلەی ئەنفـالەوە و چـۆن دڵـم بەروەسـت دەدات خیانەتیـان بـدە مەپاڵ.. ئەمە هەر نەبووە و ناشبێت.

دیسـان ویـژدان ڕێـگەی نەدا پـراوەی لە خەیاڵـدا بکـات. پاشدان گوتی:

- بە لەعنەت بێت شەیتان.

بەداخەوە مرتاندی و گوتی:

- مانگ لە چواردەیە و حەوجە بە پەنجە ناکات، قەبرغەی شێروشەپارانی خۆمان دوای نەمانیان دەگرتەوە.

سەری نارەزایی لەقاند و گوتی:

- ئەوانە دوای بە فەتارەتچوونیان لە پێناو خزمەتی گەل و نیشتمان لێبانلێسی داگییەکانیان بدرێتە پاڵ کوفرێکی بە بارەبارە.

- ئەوا شەو بەرەو شەبەق دەکشێت هەتاکو خەڵک وەئاگا نەهاتوونە ئەوسا دەناسرێم........

نەیهێشت تەواوی بکات و بلەزەوە گوتی:

- راستە بەرپرسانمان بەدەیان جار تۆتکەیان لە کوانەکانی ژێردەستی داگییەکان گرتووە، بەڵام ئەمڕۆ بوونەتە خۆراکی ئەنفالەوە و حەرەجیان تاوانە لێ بگیرێت.

بەسەر لەراندنەوە گوتی:

- بە چیدا زانیت؟.

- بەو چاوانەم دیون.

لەگەڵ ناولەپ بەیەککدانی قارەوە گوتی:

- لە بێخەبەران کەشکەک سەڵاوات. ئـ. هـ.

- بینینی دیدەکانیشت دەچێتە ژێر قەپێلکی چەواشە شۆڕشەکەتانەوە.

بە نیمچە پێکەنینەوە گوتی:

- له مه‌رامیشم ده‌گه‌یت.

جا به‌ده‌ست هه‌ڵبڕینه‌وه‌ گوتی:

- خواحافیز.

ته‌واو له‌ نیازی حاڵی بوو و گوتی:

- سه‌رم سوڕماوه‌ ئه‌و قوڕبه‌سه‌رانه‌م به‌ چاو دیون له‌ پێناوی به‌رژه‌وه‌نـــدیی گه‌ل و نیشـــتمانه‌که‌یان وه‌ک ئـــێمه‌ بـــوونه‌ وه‌رقولی ئه‌نفاله‌وه‌. چۆن دڵـم به‌رووه‌ست ده‌دات خیانه‌تیـان بده‌مه‌ پاڵ.

هه‌رچه‌ند سه‌ری ده‌هێنا و ده‌برد بۆی یه‌کلا نه‌ده‌بووه‌وه‌.

- ده‌بـێ بۆچـوونه‌که‌ی ڕاسـت بێـت؟. چ بـاوه‌ڕم نـایه‌ت، ناوه‌ڵڵا.

دوای دامان و بیرکردنه‌وه‌یه‌کی زۆر گوتی:

- ده‌بێ چاوه‌کانی خۆم درۆیان له‌گه‌ڵم کردبێـت، ئه‌گه‌رنـا چۆن ئه‌و قسه‌یه‌ی ده‌کرد.

بروای هه‌رگیز نه‌ده‌هات و له‌ ناخه‌وه‌ دووباره‌ چـۆوه‌ دوێ و گوتی:

- ڕه‌نـــگه‌ له‌به‌ر ئه‌وه‌ کـــافره‌ و هه‌وه‌ســـتی به‌ ئێمه‌مانـــانی موسوڵمان نایه‌ت و ئه‌و بوختانه‌ی هه‌ڵبه‌ستاوه‌.

***

پیرمۆتک لەناو ئامانەیەک بوو، پەردەی جامەکەی کەرخی تۆزێک لادرابوو، بەدیقەتەوە سەیری دەرەوەی کرد، لە حەیفان سەری خەفەتانی بادا و لە دەروونەوە دوا:

- بەداخەوە نەتەوەکەم هەنووکەش نازانن: کەر لە کوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ دڕاوە.

-ئـ.. هـ ئێمەی باشوا خاوەن ئەو سەرکردە دەسکردە دۆڕاوانە بووین، بۆیە هەتا ئەمڕۆی حازری چیمان بە چی نەکردووە و ناشکەین. ئەو هات و هاوارەی چەند ساڵەی منیش جگێکی پووزەی نەهێنا، بگرە بە کابرایەکی درۆزن و بەکرێگیراوی داگیبەکانیان دەخەملاندم، هەتا ئاوا نغرۆی هەڵدێرێکی کاکی بە کاکیی نەمانیان کردین.

بۆ ئەوەی حەقیقەتەکەیان لەم ساتە مەرگەساتەدا واڵا بێتەوە و پێیان لە ڕکێبی هەڵوێستە چەوتەکەی چەند ساڵەیان داکەلێنن، کە لەم کاتە سامناکەدا نانێکی سووتاوی نەدەهێنا، تەنیا حەزی وای دەخواست. ڕووی بە دوودڵییەوە لە ئەوەی تەکییەوە کرد. برازای مام شێخ و لە سیاسەتی سەردەمیش هاونیری بوو، کەچی لەبەر ئەو سێ جەندرمەی دوژمن، بۆ ئەوەی خەڵکەکە نەتوانن فیرار بکەن سوار بووبوون، نەیوێرا دەنگ هەڵبڕێت و بە چرپەوە بەرگوێی هەڵدا:

- بایز با جێگەمان بگۆڕینەوە.

ئەویش تەمەن سی ساڵ و کەمێک ڕۆشنبیر و پێشتر زۆری دەبوغزاند، یەکسەر سەری نارەزایی لێ بادا و لە ناخەوە دوا:

-وا دیارە ئەو خائینە گەلحۆیە لەو ساتە ترسناکەش ناحسێت ئەو کارەساتە دزێوەی ئاوقامان بووە و بۆنی ژیانی تێدا نەماوە، ئەگەرنا ئەوە داوایە!.

سەری بە ڕوویێکی زۆر گرژ و دڕدۆنگییەوە بێمرتانە، لەجیاتی جەواب بە خۆدا شۆڕ کردەوە.

پیرمۆتک حسیا لە ئاستیدا هەر بە ڕبەی تەقتەقی جاران دەپێوێت. بۆ ئەوەی لە چەنەی بیر و هەڵوێستە خۆشەویستەکەی چەند ساڵەی بدرێتەوە و نەیباتە ژێر خاکەوە، بە ڕوویێکی مڕومۆچەوە وتەکەی پڕتاندەوە و گوتی:

-ئەگەر بێتە شوێنەکەی من شتی زۆر عاجباتی وات بەرچاو دەکەوێت، لە لایەک پێ شێت و هار دەبیت و لە لایەکی ترەوە نەفرەت لە بیروبۆچوونە خۆشەویستەکەی چەند ساڵە دەتپەرست و بە هەموو هێزی گیانی و ماڵییەوە هەوڵی سەرکەوتنیت دەدا، دەکرد و سەلاوەتیش لەسەر بیروبۆچوونە دزێوەکەی من دەدەیت. کە هەردەم تف و نەفرەتت لێ دەکرد.

بەمە باوەڕی هات: دەبێ کارەساتێکی زۆر بەدیۆم و

ئێمەش عەقڵ قوندە و قەلقەلاشکی بەر ڕەشەبای خیانەت و خۆفرۆشییەوە.

پیرمۆتک هەوەستی زۆر پێ هات. کەچی لە دڵەوە منگاندی و گوتی:

-تازە دوای باران کەپەنک بەکەڵک چی دێت هۆباب؟!.
ئێمە بۆ هەتاهەتایێ لە سایەی هەڵوێستە خیانەتەکەی ئێوە فرۆشابن و بەس فاتیحەمان گەرەکە.

***

بەیانی دابوو بەڵام هێشتا مەڕ و گورگ زەریف لە یەکتر هاوێر نەدەکرانەوە، تارمایی یەک لەبەر سێرەی سۆمای مام سەلال و حەموود زیت بووەوە. یەکسەر حسیان باشوای ڕزگار بووە و خێرا بە پیرییەوە چوون و زانییان ئەو پیاوەیە کە مەحمود پێناسەی بۆ هەڵدابوون و بەدەست لە ملوەراندندا هێنایانە حەوشە و ویستیان بیبەنە ژوورەوە، مام شێخ ڕازی نەبوو و گوتی:

- تکاتان لێ دەکەم هێندە ئاوم بدەنێ و چیتر لە حەوشەی خۆتانم گیر مەکەن، نەبادا بە هۆی نێوچەوانە دمۆرەکەی من ئێوەش تووشی کارەساتێک بکرێن.

ئاوێکی زۆری خواردەوە و ڕووی لە دەرەوەکرد، مام سەلال گوتی:

- دە ڕاوەستە هەتا هێندە خواردەمەنیت بۆ بێنم.

- زۆر مەمنوون، گەدەم لە تاوان ئەوەندە پڕە بە زۆریش بێت لوقمە زادێکم بۆ ئاوا ناکرێ.

دەستی بۆ بەرکی خۆی برد هێندە پارەی دەرهێنا و گوتی:

- بەس تکایە ئەو پارەیەم لێ وەرگرە.

- کاکە گیان تاخیرم مەکەن، ئەوەندە پارەم لایە پێی بگەمەوە دەڤەری خۆم.

مـام حەمـوود لەگەڵـی چـوو هەتـا دووراودوور گەراجـی نیشان دا.

***

له حەدوسـەدی ڕۆژوبـان کەوتنـدا بـوو هاشـم گەڕاوە، کەچی ڕەنگی لەبەروە نەمـابوو و بەدەنیشـی چـرک و هـۆڕ دەلەرزی و هێشتا پێـی نەنـابووە حەوشـەوە، دەسـتی لە ملـی باوکی وەراند و چەند دەقیقەیەک گریان بەرۆکی بەرنەدان، لەگەڵ مام حەموودیش هەمان تاس و حەمام.

له سیری هەتا پیازی بۆیانی دەورکردەوە.

هەرسێکیان هەنێوب له پرمەی گریانیـان داوە و دەسـت و سەریان بۆ حەوا هەڵبڕی و گوتیان:

- خوایە تۆ لە ژووری سەرمان ئاگاداریـت، ئێمە کەم و زۆر لەو کـۆمەڵە زنـدەبەچاڵ و کـوفر و لە ڕەوشـتبەدرەدا بەشدار نینە و غەزەبی خۆتمان ئاوقا مەکە.

***

مـام شـێخ هەرکە گەیشـتەوە کـوانی یەکەم، لە بەرایـی هەموو شتێکدا ئەو پێشمەرگانەی لەملا و لەولا چەنـد دیـتن کە لەبەر چـاوییەوە لە نێـو زیـلان پەسـتران. هەر ئەو سـاتە وتەی ئەجندەکەی:

- "لە بـێخەبەران کەشـکەک سـەلاوات"ی هـاتەوە یـاد و لە هەر چوار سکۆڵەی دڵییەوە سەقا درا، مامۆستایەکی پسپۆڕ و زۆر شارەزا و لێزانە و قسەکەشی وا لە کونی کارک ڕاستر دەرچوو:

چەواشە شۆڕشێکی ڕاستەقینە بوو. ما خەفەتان بـۆ ئەوەنـدە ساڵەی هەوڵ و کۆشانەکە بخوات. کە لەنێو گەڕی خەبـاتی ڕامیاریی چەکداری خیانەتەوە، بە موشتاقەوە گەوزانی دەدا.

چزەی حەسرەت لەنێو ماسـوولکەکانی ژێرپێـی مێـرووڵەی کرد و لە تەوقی سەری دەرچوو.

چاوی کەوتە دنیای ڕەشکەوپێشکەوە.

چەند کەسی تەنگەتـاو بە پیـرییەوە هـاتن، کەچـی چـاوی هەر ئەوەتە هەتەری دەکـرد کە ڕەشـایینە و وا بە پیـریەوە دێن.

گریان بەر بینگـی گـرت و سەرەسوڕە هێـڕی کـرد، هەر هێندەی زانی لەسەرڕا شەپەی هات و لاتە عەردێکی گرت.

خەلکەکە یەکسەر بە چواردەستە هەڵیان گرت.

دوای وەئاگاهاتنەوە دەمێک کورکایەوە. باوەڕی لەم ساتەدا بە کۆشانی چەند ساڵەی نەتەوایەتیدا کە دین و ئیمانی بوو، بۆ یەکەم جار لە کۆڕی ژیانیدا لە دوڕ مێشکییەوە سڕایەوە. بەگریانەوە ما بمنگێنێت:

- تف.. لە خۆم و خەباتی ئەوەندە ساڵەم.

- نەفرەت لەو حیزبەش کە چەند ساڵە بە درۆ هەڵی هەناندبووم.

- نەفرەت لە سەرکردە گەورە و گچکەکانمانەوە.

پیرمۆتکی لە کاتی پڕمەی گریاندا هاتەوە یاد و چاوە تەژی سڕیلەی درشت و خەم و بێ ئومێدەکانی، دەلحاز گەش هەڵگەڕان و گوراح خۆشی بەسەر ڕووە دەغەزەدارەکەی زاڵ بوو و ئەو قارو ڕق و غەزەبانەی کە لە ئاستیدا چەند ساڵە لە ناخی دەروونییەوە پەپکەیان خوارد بووەوە بوونە قلێپێکی دەنگدار و شوێنیان حەز و خۆشەویستی و مەزناتی و کارزانی بە کونفەیەکونێک پڕکردنەوە.

کەچی خەفەتی بە فەتارەتچوونەکەی وا دایگرت خۆی لە قەرەی فەوتانی بنەماڵەکەی دەدا.

تەواوێک بۆی کورکایەوە و گوتی:

- سەت خۆزگە منی عەقڵ قونـدە و عولعـولی و دۆڕاو لە بریتی ئەو کەسە پایەبەرزە بوومایە!

ئەوسا بێگومان بە هەڵوێستە مەزنەکەی بـاوەڕی تەواو بەو باشوایانەی مـاون دەهێنـا و پێـنج فەرزە نەفرەتیـان لە ئـێمە و حیـــزبە خائینەکەمانیـــان دەکـــرد، خەبـــاتی ڕاســـتەقینەی لە ناخیـــانەوەی دەڕووژانـــد و ئـــاڵای ئـــازادی و ســـەربەخۆیی دەشەکاندەوە.

هەرکە چـاوە پـڕ ڕۆنتکەکـانی سـڕینەوە، سـەری بەرز کردەوە دیتی پیرمۆتک وا گورگەڵۆقـانە بەرەوڕووی دێـت، تەزووی خۆشی سەرتاپای جەستەی تەنی و بەوپەڕی خولـق خۆشییەوە گوتی:

- کەر لە کوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ دڕاوە؟!!

هەردوو باڵی بۆ ئاوێزانی واڵا کـردەوە، کەچـی توانـای بە پیرچوونەوەی نەبـوو. هەرکە گەیشـتە لای گـوڕی شـنگ و غیرەت جەستەی داگرت و لەژێـر هەردوو پیلـی ڕووبـوو و بە جڕەجڕ تـوانی بەرزی کـاتەوە و قەفەزەی سـینگی خسـتە بـان تـۆقەڵەی سـەری، ئەوجـا بەوپەڕی ڕێـز و ئەوینیـیەوە ڕوومەتە خـڕ و گـوپنە گچکەکـانی چەنـد جـار بە شـەوقی گریانەوە ماچ کردن.

جۆشدارانە گوتی:

- ئیستاکە بۆم واژی بووەوە تەنیا هەر تۆ لەناوماندا بنیادەمی

ڕاستەقینە بوویت و ئێمەش جاشک و گۆلک.

لە دەروونەوە دوا:

- تازە بە تازە بە کەڵک چی دێت کاکی بارەبەری نەزانین و خیانەتەوە.

بەڵام کەیفداری داننان بە هەڵە و خیانەتەکەی و قار و ئەنفالەکەش هیچی لە دەروونیدا نەهێشت.

- بۆ میللەتی باشوات دەرخست خۆر لە کاملا هەڵدێت و شۆڕشی ڕاستەقینە، لەمەودوا ئەوەیە هەردەم دژی گودلە و ڕیشە بوەستیت، ئێمەش گزرەی بەرتەوژمی هوڕەی جەهالەت و گۆڕدایەتییەوە.

لە خۆشییان دووبارە گریان بەربینگی گرتەوە و:

- دەرکەوت لە ئەجندانیش لە ئاست خێر و چاکەدا کاریگەرتریت.

بەمە پێکەنین دایگرت.

- ئێمەش دوای ئەوە بە چاوی خۆمان دیت چەکدارێکمان، کە ناومان نابوون پێشمەرگە، بۆ سوونەتیش بەر ئەنفالە شوومەکە نەکەوتوونە، مرۆڤێکی فریودراو کەودەرییەکی وا بووین هەردەم ئەبوو حەشیشانە بە فیتی جاش و خۆفرۆشان هەڵدەپەڕین، هەتا لە ناویش نەچووین نەماندەزانی ڕاستی ڕووی لە کام لایە.

له پـــرمەی گریـــانی داوە و پـــاش هێوربـــوونەوە زاری خۆشەویستی پچڕاند و گوتی:

- باشە کاکە گیان بۆ خـۆت لەو سـارایە چۆڵوهـۆڵەدا ئـاوا لێ نەناس کردم، وێڕای ئەوەش جێت هێشتم؟!.

- ئەوەی ڕاستی بێت ترسام تەرحی چەنـد سـاڵەی ڕابـردوو بۆم نەسەلمێنیت و لەم ساتە مردنبارینەشدا لەگەڵم بکەوینەنێو مشتومڕی بێسوودی گۆڕینەوە.

ئەمەی بە هەموار چوواند.

- گریمـــان هەردووکمـــان بەیەکەوە ڕوومـــان لە شـــارەکە بکردبـــووایە، یەکســـەر ئاشـــکرا دەبـــووین. دڵنیـــاش بـــووم شوفێرەکە بە هاناتەوە دێت. بۆیە جێم هێشتوویت.

- من تۆم دیت لەنـاو ئامـانەکەدا بوویـت، لە پـێش بـاییزی برازایمـان ڕاپـێچ کردیـت، پـێم ناڵێیـت چـۆن خـۆت قوتـار کردووە؟!.

- هەرکە دایانبەزاندین من خـۆم خسـتە ژێـر سـەیارەکەوە، کاتێک شوفێرەکە گەڕاوە من خـۆم بە دواوەی هەڵواسـی و هەر کە تۆی دابەزاند، ئامۆژگـاری کردیـت، دڵنیـا بـووم بە ڕۆژ بە هاناتەوە دێت.

ئەوسـا مـن لەسـەر زگ بـۆ ئەوەی نەمبیـنن بەرەو دواوە کشامەوە.

کە شـەو لە شـار نزیـک بـوومەوە دوو پیـاوم دیـتن لە بەردەرگای حەوشەی ماڵێک وەستابوون.

نەیهێشت تەواوی بکات و گوتی:

- ئەوە مام سـەلال و حەمـوودی پیاوباشـی شـارەکە بـوون، دڵسۆزانە بە هانامانەوە هاتن و گەراجیان نیشان دام.

- هەتا نەمبینن خۆم لا بە لا گەیاندە گەراجی شارەکە.

- ئەدی بە چی هاتییەوە؟!.

- بە پارەی خۆم.

- چۆن جەندرمەکان لێیان نەستادیت؟!.

بە بزەیەکەوە گوتی:

- لە بەلەکی خۆم پێچابوو.

ئەمە شادی پەڕاندە جەستەیەوە و گوتی:

- دەرکەوت ئـا لێرەشـدا تـۆ لە ئـێمەی کەمفـام و نەزان بیرتیژتر بوویت.

***

مام شێخ دوای گەڕانەوەی ماوەی چل ڕۆژ لە شروان لە ژوورەوە، مەگەر بە دەگمەن نەدەهاتە دەرەوە، بە پێچەوانەی هەڵوێستی پێشووی هەر کە چاوی بە چەکدارەکانی گودلە و ڕیشە دەکەوت، هەردەم جرتوفرتیان بوو، هاروهاج دەبوو و غەزەب دەبووە تارمایی و بەرچاوی دەگرت و ئیمانی لە بەدەندا دەپەڕی و پشووی سوار دەبوو، لە ڕۆیندا سەیتەرەی لەسەر لاقەکانی نەدەما و چۆکەکانی تەق تەق بەیەکتر دەکەوتن.

ناوە ناوە لەبەرخۆیەوە، بە نیمچەگریانەوە دەیپرماند و دەیگوت:

- ئێمەی باشوا چەند گێل و نەفام بووین و باوەڕمان بە حەز و موشتاقەوە بەو جاش و خۆفرۆشانە هەبوو، کە سەرکردەی گەل و نیشتمانن و دوارۆژ ئاڵای سەربەخۆیی و خۆشگوزاری لەژێر باڵیانەوە دەشەکێتەوە.

ماوەیەک بە سەربادانی قارەوە کەسەرانی لە دوڕ هەناوی پەستا و گوتی:

- لە ناومان تەنیا پیرمۆتک نەبێت دەیگوت:

- کەر و زینیان نەگوتووە. سەرکردەی دەسکردی دوژمنان و سوودبەخش کوجا مەرحەبا.

ئەوجا ئێمەی مێشک کاتێکراو لە ناخمانەوە بە گۆردە و خائینمان لەقەڵەم دەدا.

چەند مانگی بەم چەشنەی بەسەر برد، ڕۆژێک بە مەراقەوە ڕووی لە پیرمۆتک کرد و گوتی:

- ئێمە هەر ئاوا دەستەوەستان بین لە ئاست ئەو خائینانە و تەکانێکی تۆڵەسەندنەوە لە خۆمان نەدەین؟!.

ئەوسا حسیا هەستی نیشتمانی و نەتەوایەتیی ڕاستەقینەی دژی پێشوو لە دوور مێشکییەوە خەزەڵەی دەرکردووە زۆری هەوەست پێ هات و گوتی:

- ئەوەی جەنابت دەفەرموویت تەرزی نوێژ و ڕۆژی لەسەر گەورە و گچکەی ئێمەی باشوا فەرزە. بەس پشوودرێژی و نهێنییەکی وابێت گۆڕدەکانیان کەم و زۆر پێ نەحسێن. ئەگەر نا بەکونفەیەکونێک ڕچەڵەکمان دەبڕنەوە.

- ئەوجا ئەوە دەکرێت؟!.. ئـ .. هـ ئەندامانی حیزبەکەمان هەموویان لێبانلێسی ڕاستەقینەی ئەوانن.

- ڕاست دەکەی. بەس دەبێ ئێمە کەم و زۆر ڕووی سیاسەت و خەباتمان لەمەودوا تەرزی پێشوو هەرگیز لە خائین و جاشان نەکەین.

ئەویش بە مەراقەوە گوێی بۆ هەڵخست.

- ئەگەرنا دیسان ڕەنج بە خەسار دەبینەوە..

عەقڵی بۆچوونەکەی گرت و پێچەوانەی پێشتر دڵنیابوو لەم تەرزە بیروبۆچوونانە، ناکەوتە نێو کەندڕی هەڵەوە و بە

شەوقەوە گوتی:

- ئێـ...ی؟!..

هەستی کرد مەراقێتی، لە ملی زۆر خۆشبوو و گوتی:

- لەمەودوا پێویستە بە نهێنی پەیوەندی بە گەنجە ڕۆشنبیرەکانی میللەتەکەمان بکەین و بە هۆی ئەوانەوە دەتوانین بە زووترین کات بە نیازەکەمان بگەین.

بە بافرەیەکەوە لە ڕووە کەیفدارەکەیەوەی ڕووانی و گوتی:

- هەردوولامان تەقەلا بدەین، لە لایەک بێ ئەوەی گرووپی هەریەکەمان، بۆ ئەویتر واڵا بێتەوە، لە لایەکی ترەوە بیروباوەڕیان بە سۆزی گەل و نیشتمان و سەربەستی و شۆڕشی ڕاستەقینە و بەرهەمەکانی دوارۆژ و خیانەتی گودلە و ڕیشەوە لە ناخی جمجمەیانەوە وا ئاو بدەین. بە هیچ پڕوپاگەندەیەکی لابەلا شلۆق نەبێت.

پشووێکی شادی هەڵکێشا و گوتی:

- ئەوجا دەتوانین زەبری کوشندەی خۆمان بوەشێنین و کەسیش پێمان نەحسێت.

ئەوانیش بێگومان سەریان لێ دەشێوێت و هەرگیز نازانن دوژمنیان کێیە؟!.

هەر کە ئەمەی لێ بیست بە شاگەشکەییەوە گوتی:

- بە داخەوە ئەگەر ئێمە لە هەوەل وەهلەوە بە گوێرەی پرۆگرامە ڕاستییەکەی جەنابت شەقاومان بنابووایە و بەدوای قەلقەلاشکی بابردوو نەکەوتینایە، بێگومان تووشی ئەو کارەسات و نسکۆیانە هەرگیز نەدەبووین و گەل و نیشتمانەکەشمان بە ئاواتی خۆیان دەگەیشتن.

ئەمەی گوت و گورج قیتبووەوە و دەستی خۆشەویستی لە هەوگی وەراند و بەوپەڕی سۆزی حەزەوە گۆناکانی دوو سێ کەرەت ڕامووسی و گوتی:

- من ناوم مام شێخە. خزمەتێکی یەکجار زۆری کەسانی شاش و فیش و خۆفرۆشانم کردووە و جاشێکی قەوچ و قەڕاسەداری داگیرکەران بووم. بۆیە ئەمڕۆ وا بێزی لێ دەکەمەوە و بە ((مام چقل))ی دەگۆڕم. بەلکی ڕۆژێک دادێت لە بریتی هەلەی تایەنمەوە بچەقمە دوڕ چاوی کەسانی گۆڕینەوە.

***

پێنج ساڵی ڕەبەقی خایاند. چەند گەنجی دڵسۆزو لە گوێ و حەمد دەرنەچوونیان ئەفراند.

بۆشیان شیکردنەوە کە گودلە و ڕیشە دەسکردی داگیرەکانن و هەتا ئەمڕۆی حازری سوودی قڕنەیەکیان نەبووە و لەمەدواش نایانبێت.

ڕۆژانە چەند سەعات بەم چەشنەی باس کرا ڕاهێنانی فیکری و جەستەییان بە دزی پێ دەکردن.

ڕۆژێک چەند کەس لە گرووپی مام چقڵ خۆیان کردە پۆلیس و پێشتر زانیبوویان گودلە بە سەفەر چووە و بۆ ئێوارە دەگەڕێتەوە، چوونە سەر ڕێگای و هەرکە گەڕاوە ڕایانگرت و یەک لە پۆلیسەکان گوتی:

-زەحمەت نەبێ دابەزە.

ئەویش بە لووتبەرزییەوە گوتی:

-وا دیارە من ناناسن گەمژەینە؟!.

نەیانهێشت چیتر بڕێسێت و بە پێکەنینەوە گوتیان:

-با.. با .. چاکت دەناسین تۆ گودلەی جاشی دەسکرد و خۆفرۆش و گوردەی هەر سێ داگیرەکانیت.

بەمە لە قەپێلکی خۆی دەرچوو و غەزەب ڕووی داگرت و لە حیددەتان پشکی دەهێنا و بە هەڵچوونەوە گوتی:

-ناکەسبەچەینە چ مامۆستایەک فێری کردوون ئەو گووە گەورەی دەرحەق سەرکردەیەکی مەزن و ڕێزداری وەک من بخۆن.

لە هەردوولاوە چەکیان لێ هەڵکێشا و گوتیان:

-بەڵێ بەڵێ چاک دەزانین تۆ جاشێکی خائینی لە ڕەچەڵەکەوە.

ئەمەیان گوت و بەزەبری قۆنداخان دایانبەزاند و لە ڕێگەی گشتیان دوورخستەوە، هەردوو گوێیان لە بنوبۆتکەوە قوت کردن و بەرەڵلایان کرد.

***

ئێوارەیەک گرووپی پیرمۆتک زانییان ڕیشە دوای نوێژی خەوتنان چووتە یانەی ((..............)) ئارەق بخواتەوە. کە خووی پێوە گرتبوو. چوار پێنج چەکدار سایەدیان کرد و هەر کە لە یانەکە هاتە دەرەوە، سەیارەکەیان لە دەست ڕاستاند و دەمیان بەستا و بردیانە پەنایەکەوە، ئەویشیان قوتە کرد.

***

نـزیکەی دوو سـێ مـانگی ڕەبەقـی بەسـەردا تێـپەڕی چ دەنگوباسی چاک و خـراپ دەرحەقیـان نەبیسـترا. تـومەز بە جەمەدانییەکانیـانەوە سـەر و گـوێلاکی خۆیـان وا دەپێچـا گوێیەکانیـان دادەپۆشـرا. کەسـیش نەیـدیبوو هەتـا بـڵاوی بکاتەوە.

تاکو ڕۆژێک بە فیتی پیرمۆتکەوە چەند منداڵە وردکەیـان تێگەیاند و ئەمەشیان فێـر کـردن کە ئێـوارە شـرەکە دەبـوو لەسەر شەقامە سـەرەکییانەوە، بە چەپڵەڕێـزان و دەنگـی زۆر بەرزەوە ئەمانەیان دەچڕی:

بمرێ بمرێ ئابڕووڕژاو
گودلە و ڕیشەی هەتکراو
گوێبڕاوی ئاخر زەمان
دوژمنی گەل و نیشتمان
بۆ دەرەوە دەسکردەکان
جاش و گۆردەی داگیەکان

لە دوو سـێ ڕۆژی زیـاتر نەخایانـد، لەسـەرتاپای شـار تەقیـیەوە و ئابڕوویـان لای عەرەب و عەجەمـان بە جارێـک ڕژا و هەراسانیان لێ هەڵگیرا، دەسەڵاتی بەرپەرچدانەوەشیان نەک بە هیچ شێوەیەک نەبـوو، بگـرە هەرگیـز نەیانـدەزانی

دوژمنەکانیان کێنە تاکو چنگە پڕە یەک بەقەدەر توانا بکەن.

ئەمە کـــاری وا لـــێ کـــردن لە دەســـەڵاتیاندا نەمـــا لە هەفتەیەک زیاتر خۆیان بگنخێنن و بارگەوبنەگەیـان پێچاوە و بە هەشـتاوییەوە چەشـنی لە دزی گیـرابن بەرەو کـوانی دووەم هەیپەیان لێ کرد.

دوا بارگەیـان کە گەیشـتە نـاو ڕووبـارەکەوە، منـداڵەکان هەتـا پەڕیـنەوە بە پـلارەبەردی دەســت و بەردەقـانییەوە بەردومانیـان کـردن و دروشمەکەشـیان بە دەنگـی بەرزەوە دەچڕییەوە.

**کۆتایی**

**٢٠١٩ – ٧ – ٢٥**

## ڕاڤەکردنی چەند وشەیەک

**بانگۆلە:** ڕشک گەرای ئەسپێیە، هەر کە تەقی زندەوەرێکی بچووکی لێ دەردێت. ((بانگۆلە))ی ناوە. پاشدان دەبێتە ئەسپێ.

**بڕەسۆرە:** گزگزە گیایەکی باریک و بێهێزە و پەل بەملاوبەولادا داوێت و لە هاویندا دەڕسێکت و لە پایزدا وشک دەبێت، ڕەنگی سوور هەڵدەگەڕێت و زوو ئاگر دەگرێت. واتە ئاگرەکەی گڕوفڕێکە.

**بنۆڕە:** کوندەی ئاو کە کۆن بوو لای دامێنی زووتر دەڕزێت و کابان ڕزییەکەی لێ دەکاتەوە، شوێنەکەی دەدوورتەوە، ئەوسا لە کوندە بچووکتر دەبێت و بە ((بنۆڕە)) ناو دەبردرێت.

**پووزە:** جگێکە هێسکەکەی لەبەر زۆرکۆنی قوڕسایی نەمێنێت و سووک بێت.

**ئایەن:** گۆڕین. ناوبراو. باسکراو.

**جەوەندە:** کوندەیەکی بچووکە و لە پێستەی کار و گیسک

دروست دەکرا، ئاوی خواردنەوەی شوانی تێ دەکرا بۆ ئەوەی لەبەر هەتاوی دەشت ئاوەکەی گەرم نەبێت، شوانەکە لەژێر سکی گوێدرێژی هەڵدەواسی.

**چرگە:** گیایەکی زۆر وردە لە پاڵ یەکترە و بە چڕی دەڕوویێت.

**حاجی فاتمە:** زەمانی زوو کێوەلیی عەرەب دەهاتن لەسەر سەکۆی دیوەخان پیاوەکان ڕەبابەیان لێ دەدا و عەتابەشیان دەگوت. ئافرەتێکیش هەڵدەپەڕی و چەفییەیەکی ڕەشی لەدەستبوو، لە کاتی سەماکردندا هەر کەسێک درهەمێکی بدابووایە، ئەویش چەفییەکەی دەدایە. لە کاتی پشووداندا ئافرەتەکە دەچوو لای چەفییەهەڵگر دادەنیشت و ڕانی بەڕانی دەکرد، هێندە جار دەستیشی بۆ دەبردرا. ئێمەی کورد بەم تەرزە ئافرەتەمان دەگوت: حاجی فاتمە.

**خەزەڵ:** لەژێر بەرزایی هێندە شاخان ئاو تنۆک تنۆک دێتەخوارەوە. جۆرە گیایەکی ورد و چڕی لەپاڵ یەکی لێ شین دەبوو. هەر کە تنۆکە ئاوەکە چکی دەکرد، گیایەکە زەرد هەڵدەگەڕا و ئەوسا پێی دەگوترا: خەزەڵ.

**دەغەز:** غەرەز. ڕق. کین.

**دڕدۆنگ:** کەسی ڕوو گرژومۆن.

**سەقا:** کاتی خۆی ئاسنگەر هەر شتێکی لە ئاسن دروست دەکرد، پاش دەستبەربوونی لە نێو کوورەی ئاگر سووری دەکردەوە و یەکسەر دەیخستە نێو ئاوەوە تاکو پتەو بێت. بە سەقا ناو دەبردرا. لە نووسیندا بە چەسپیو لەقەڵەم دەدرێت:

"من قسەکانی ئازادی هاوڕێم لە ناخمەوە سەقادراوە". واتە بە ڕاست چەسپیوە و زۆر لە درۆ دوورە.

**سێکوان:** بچووککراوە (تصغیر)ی ((سێکۆلانە))، سێ کۆڵان لە گەڕەکێک بێنەوە سەر یەک.

لێرەدا ناوە بۆ شارێک.

**فسەگورگ:** زیندەوەرێکی بچووکە لەنێو خۆڵی ورد دەژێت. شوێنەکەی بە ئەندازەی پەنجەیەک قووڵ دەکات.

**کەندڕ:** وا دەبوو گردێکی بڵند دەکەوتە ڕۆخ کەندێک. ئاوی کەندەکە ساڵانە لایەکی گردەکەی دەڕماند و تەرحی دیواری لێ دەهات. لە هێندە شوێنان بەرزی لە چوار پێنج مەتر هەتا دە دوازدە مەتر دەبوو. باڵندە هێلانەیان لە قەدی دروست دەکرد. ئەمە پێی دەگوترا: کەندال.

ساڵ بە ساڵ ئاوی کەندەکە بە تەک کەندالەکەدا دەڕۆیشتە ژێری بە ئەندازەی مەتر و مەتر و نیو دەکۆڵی و بەرزییش نیو

مەتر. ئەمەش بە کەندڕ ناو دەبردرا.

زۆر جار لە کاتی بەرخەوانیمدا و لە گەرمای ئاخیر وەرزی بەهاردا، دنیا ئەوسا گەرم دادەهات دەچووم لە سێبەری کەندڕەکە، زۆر فێنک بوو لێم پاڵدەداوە.

**کەنووش:** جێگەیەکە تۆزێکی شکا بێت.

**کوان:** بچووکراوەی کۆڵانە و لێرە کراوەتە ناو بۆ دەڤەر و ناوچە.

**کونە فیرار:** بەم تەرزە بوو. لە زەمانی بەعسی گۆڕبەگۆڕچوودا، گەنجی دێهاتەکان بۆ ئەوەی سەربازی و جەیشی شەعبی نەکەن، لە دوور ژووری ماڵەوە چاڵێکیان بە بەژنێک قووڵ لێ دەدا و ژێرەوەیان وا بنکۆڵ دەکرد هەتا لە ژوور دەچووە دەرەوە. ئەوسا کونێکیان تێ دەکرد کە بە ئەندازەی بەلووعە، یان سۆندەی پێوە بچێت، ئەویش بۆ ئەوەی هەوای لێوە بێ و بچێ.

هەر کە هێزی بەعسی دەردەکەوتن لێکڕا دەچوونە نێو چاڵەکەوە و شەپکە دارێکیان لەسەر کونەکە دادەنا، ڕایەخیان لەسەر ڕادەخست و هەناسەیان بە هۆی بەلووعە و سۆندەوە دەخواردەوە.

**کۆندڕ:** ئەو قۆرتەیە کە بەهۆی هاتنە خوارەوەی ئاوی باران لە شوێنی بەرزدا پەیدا دەبێت.

**گڕوێر:** پارچە قوماشێکی بچووک بوو لەژێر هەنگڵی کراسی ئافرەتان دەدرا.

**گورگە:** بەم دوو مانایە دێت:

یەکەم: کاتی خۆی هێندێک لە دانیشتووانی دەشت سواندەیان لەسەر دیواری حەوشە دروست دەکرد تاکو لە لایەک باران کار لە دیوارەکە نەکات و لە لایەکی ترەوە دەعبا، تەرزی گورگ نەتوانێت پێ هەڵگەڕێت.

دووەم: سرک، وشت، قولاخ. مەبەست لێرەدا ئەمەیانە.

**لەواشە:** یەکەم: جۆرە کولێرەیەکە.

دووەم: دوو پەلەدارە لچی ولاخی بەرزەی پێ دەگیرا، لە کاتی نالکردنیدا تاکو نەتوانێت خۆی بجوولێنێت، یان لوشکان باوێت.

**لێبانلێس:** ئەم وشەیە من دروستم کردووە.

لێبان: شتێکی لیچە و بە لەشی بێچووە ئاژەڵەوەیە کە تازە لە دایک دەبێ، دایکەکە دەیلێسێتەوە، منیش ((لێس))م بۆ زیادکرد بوو بە لێبانلێس، بەو کەسەی دەگوترێت کە مێچکەمێچکە و

کوسکێشی لەبەر بەپرسان زۆر دەکات.

**مرتە:** بەم دوو مانایە دێت:

یەکەم: مرتە. قسەیەکی کەم: "ئەوەندەی ئێمە قسەمان بە ئازاد گوت ئەو کەم و زۆر مرتەی لەبەروە نەهات".

دووەم: مرتە، ئەو پتکە گۆشتە بچووکەیە کە دوای سەربڕینی ئاژەڵ بە پێستەکەیەوە دەمێنێت.

**نارچە:** نۆرینگ. سپێر. ڕەبیە. ئەو شوێنەیە کە بنیادەم لە کاتی هەڵگیراسانی شەڕدا خۆی لەناوی مەلاس دەدات.

**وەرقوڵ:** بەرکول.

## لیستی کتێبەکانی دەزگای فام (2019)

١- پێگەیشتن، بیرەوەرییەکانی میشێل ئۆباما، میشێل ئۆباما/ وەرگێڕانی: هێما ئەحمەد.
٢- تیۆری فستق١، گەشەپێدانی مرۆیی، فهد عامر الاحمدي/ وەرگێڕانی: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی.
٣- زانکۆ بەخێرهاتنت دەکات، ڕێبەر بۆ فێرخوازانی زانکۆ، جاسم بن هارون الهارون/ وەرگێڕانی: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی
٤- زازانا، ڕۆمان، کامەران خۆشناو.
٥- ئەتەکێتی سەردەمییانە، چۆنییەتی هەڵسوکەوتی ڕۆژانە بۆ گەیشتن بە لووتکە، ئەتەکێت، دۆرسیا جۆنسن، لیڤ تایلەر/ وەرگێڕانی: کۆمەڵێك وەرگێڕ.
٦- پێغەمبەر و پێغەمبەرناسی، ئایینی، سەرحەد یونس محەمەد.
٧- هێزی ئێستا، ڕۆحانی، ئێکهارت تۆلێ/ وەرگێڕانی: بنار جەبار
٨- جثثُ أحلام، شعر، نرکز ادریس شکر.
٩- ضجيج أبْكَمْ، شعر، إليسا حاجو.
١٠- زنجیرەی ڕەوشتە باشەکان، منداڵان (٨ کتێب)/ وەرگێڕانی: کەوسەر تەها
١١- زنجیرەی خێزانەکەم، منداڵان (٤ کتێب)/ وەرگێڕانی: کەوسەر تەها.

## لیستی کتێبەکانی دەزگای فام (2020)

١- نیل بە سارای سیناوە، گەشتنامە، کەریم کاکە.
٢- سەما لەگەڵ ژیان، ژیاندۆستی، مەهدی ئەملووسەوی/ وەرگێڕانی: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی.
٣- دەمەوێ بژیم، ژیاندۆستی، مەهدی ئەملووسەوی/ وەرگێڕانی: ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی.
٤- چوار ڕێککەوتنەکە، پەرتووکی ژیرییەتی شارستانییەتی تۆڵتیکەکان، گەشەپێدانی مرۆیی، دۆن میگێڵ ڕیز/ وەرگێڕانی: کاژین ئەحمەد.
٥- ڕێکخستن، هونەری ژاپۆنییەکان بۆ نەهێشتنی ئاڵۆزی و ڕێکخستنی ماڵ، هونەری ڕێکخستنی ماڵ، ماری کۆندۆ/ وەرگێڕانی: هێما ئەحمەد.



## عەزیز مەلا ئەحمەد ڕەحیم

ناسراو بە "عەزیزی مەلای ڕەش"

لە ساڵی 1938 لە گوندی چەغەمیرە، ناوچەی دیبەگە، قەزای مەخمووری پارێزگای هەولێر لەدایك بووە.

لە حوجرەی باوکی دەستی بە خوێندن کردووە.

ساڵی 1960 وەکو مامۆستا دامەزراوە.

ساڵی 2006 خانەنشین کراوە.

لە ساڵی 1979 لە تەمەنی (41) ساڵی دەست بە نووسین دەکات و وەکو خۆی دەڵێ "بە پیری چوومە بەر هەویری".

ساڵی 1979 یەکەم نامیلکەی شیعریی منداڵانی بە ناوی پشیلۆکە بڵاوکردەوە.

تا ئێستا زیاتر لە بیست چاپکراوی هەیە، کە زۆربەیان ڕۆمانن.



# چەواشە

- مام شێخ چۆن لەو جموجۆڵەی چەکدارانی چەواشە شۆڕشی ئەمڕۆ دەگەیت؟

بە غەزەب و چاوی لێڵ و وێڵەوە گوتی:

- شەکرت خوارد.

بە هەڵچوون و دەنگی قاییمترەوە گوتی:

- بڵێ شۆڕشی ڕاستەقینە.

دانیشتبوو، قیت بووەوە و جا گوتی:

- جارێکی تر هەرگیز لێت قەبووڵ ناکەم ئەو تەرحە پەتکانە لە ئاست شۆڕشە مەزنەکەمانەوە بەردەیتەوە.

لەم ڕووەوە باشی دەناسی چەند مووی بە لەشییەوەیە و کەڵکی دار تێوەردانی بە هیچ شێوەیەک نییە و بۆنی زیاتر دێت.

3,000 IQD

9 788446 209188

دەزگای فام
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

FAM PUBLICATION
+964 750 773 71 76
info@fam.pub • www.fam.pub
FAMpublication